زنجیرەی
هزری
هاوچەرخی
ئیسلامی
١٤

أبحاث في الدعوة

مبادئ الإسلام

أبو الأعلى المودودي






بنەڕەو

# ڕێبازی ئیسلام

وەرگێڕانی

عومەر ڕێشاوی
جەعفەر ڕستەخا



بەرەو

# ڕێبازی ئیسلام


نوسینی ، أبو الأعلى المودودی

وەرگێرانی

عومەر برزنشاوی — جەعفەر سەنفا

زنجیرەی: هزری هاوچەرخی ئیسلامی

ناوی کتێب بەعەرەبی: مبادئ الإسلام

ناوی نوسەر: أبو الأعلى المودودي

نۆرەی چاپ: پێنجەم

ساڵی چاپ: ١٤٠٢ك - ١٩٨٢ز

ناوی کتێب بەکوردی: بەرەو ڕێبازی ئیسلام

ناوی وەرگێڕ: عمر ڕێشاوی جعفر مصطفی

ئەرکی چاپ: پرۆژەی وەرگێڕان

نۆرەی چاپ: سێیەم

ساڵی چاپ: ١٤٢٢ك ٢٠٠١ز

چاپکردن: ئۆفسێتی هەولێر

تیراژ: ١٥٠٠

ژمارەی سپاردن: ٣٢٩ ساڵی ٢٠٠١




## پێشەکی چاپی سێیەمی وەرگێڕان

خوێنەری بەڕێز:

ئەم پەڕاوەی بەردەستمان لە نووسین و دانانی زانایەکی فرە بەناوبانگ و ناسراوە لە جیهاندا. زانایەکی ئیسلام ویست و رزگاریخوازی نەوەی ئادەمی لە نیمچە قارەی هندستاندا.. کە تیشکی رزگاریەکەی بە جیهانی هاوچەرخدا پەرش و بڵاوەی کردووە و لە گەلێ لە ناوچەکانی جیهانی ئێستاماندا شەوق و تریفەی داوەتەوە..

ئەم پەڕاوە، بە زمانی ئوردی، کە یەکێکە لە زمانە زیندووە ناسراوەکانی ناوچەی هندستان، لە بەشی پاکستاندا، وە لەبنەڕەتا ناونیشانی (نحو الاسلام) دەگەیەنێ دەرچووەو بڵاوبوەتەوە.. بەڵام لە ژێر ناونیشانی (مبادیء الاسلام)دا وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی هاورێ لەگەڵ وەرگێڕانی بۆ گەلێ زمانی تریش..

لە ساڵەکانی شەستدا، لە عەرەبییەوە کراوە بە کوردی بە ناونیشانی (بەرەو رێبازی ئیسلام) کە لەگەڵ ناوە ئوردیەکەیدا شیاوو گونجاوتر دەردەکەوێت، لەسەرەتای ساڵەکانی حەفتادا، لەبەر هەندێ هۆی تایبەت بە ناوێکی خوازراو (مستەفا عەبدوڵڵا) بەچاپ گەیەنراوەو بڵاوکراوەتەوە.. لە کۆتایی هەشتاکاندا رێکخراوێکی قوتابیان بەبێ مۆڵەی ئێمە هەستابوون بە چاپ کردنەوەی بەبێ دیاری کردنی ژمارەی چاپ..

پەڕاوی ناوبراو سەرەڕای گەلێ هەڵەی چاپەمەنی، کە تێیدا بەدی دەکرێ، لە پاش ماوەیەکی کەم کەبەسەر لەچاپدانیدا تێپەڕبوو، لە بازاڕو پەڕاوخانەکاندا نەما، کە ئەمەش بەبەڵگەیەك دەناسرێ لەسەر سوودو کەڵکی پەڕاوەکە کە بە هاورێیانی دەگەیەنێ.

جا بەم بۆنەیەوە و لەسەر داوای هەندێ لە خوێنەرانی بۆ جاری سێیەم لەگەڵ هەندێ دەسکاری و بژارو پاکژکردنی لەو هەڵە زۆرە، لەلایەن بەڕێزان (نووسینگەی تەفسیر)ەوە بەیارمەتی خوای گەورە لە چاپ درایەوە بەتەمای پاداشتێکی ترو هیوای سوود گەیاندنێکی تر..

خوا هەردەم لەگەڵ کۆششی چاکەو کارچاکاندایە..

**عومەر رێشاوی و جعفر مستەفا**

١٣/ جمادی یەکەم/ ١٤٢٢ك ـ ٢/ئاب/٢٠٠١ز

## پێشەکی چاپی یەکەم

شتێکی بێ گومانە کە زۆربەی کوردەکان موسوڵمانن و ئاینی ئیسلامیان بە دڵ خۆش دەوێت و هەمیشە بەرگریان لێکردووە و ئەی کەن، لەگەڵ ئەوەشا مەگەر بەدەگمەن ببینی پەڕاوێکی کوردی لەم ڕووەوە نووسرابێ یا وەرگێڕرابێ..

ئەمەیش بە بڕوای ئێمە هۆیەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە نووسەرە کوردەکانمان، بە داخەوە هەر کە پێنووسیان فێری نووسین دەبێ پەلامار ئەدەنە نووسینی ئەو شتانەی کە زیاتر لە وڵاتی بێگانەدا باوون، وە بە پێویستی نازانن کە لەبارەی بیروباوەڕی ئاینەکەیانەوە بنووسن، لەوە ئەچێ کە بە ئیشی خۆیانی نەزانن و دایان نابێ کە ئەم ئەرکە تەنها لەسەر شانی زانا ئاینیەکانە و نابێ ئەوان لەم بارەیەوە بیری خۆیان ماندوو بکەن و بەرهەمێکیان ببێ. زانا ئاینیەکانیشمان . ئەوانیش بەداخەوە . بە نووسراوە عەرەبیەکان خۆیان رازی کردووەو بەدەگمەن رێك دەکەوێ کە لەم بارەیەوە شتێکیان نووسی بێ، مەگەر لێکدانەوەی هەندێ هۆنراوەی ئاینی و شتی وا کە ئەویش بەتەواوی ئەم مەبەستەی ئێمە جێبەجێ ناکات

وەلەبەر ئەوەی ئەم نووسراوەی مامۆستا (أبو الأعلى المودودي)کە بەزمانی عەرەبی ناوی (مبادئ الاسلام)ە، نووسراوێکی فرە بە نرخە، کە وەرگێڕراوە بۆ گەلێ زمان، یەکێ لەوانە زمانی عەرەبیە، ئێمەیش بە یارمەتی خوا ویستمان لە زمانی عەرەبیەوە وەریگێڕین بۆ زمانی کوردی، هەرچەند ئەمەش کارێکی وا ئاسان نیە کە وێنەی ئێمە بتوانێ جوان تیایا سەربکەوێ، بەڵام (لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا)البقرة/٢٨٦. بۆیە ئێمەش هەر کارێکمان هاتە رێ هەر ئەوەندەمان لە سەرە کە هەموو توانای خۆمان بخەینە کار، ئیتر پاداشمان لە خوا ئەوێ و خوایش یاریدەدەرمانە..

**وەرگێڕان**

٢٢/ ذي الحجة/١٣٨٨ك ـ ١١/مارت/ ١٩٦٩ز

# بەشی یەکەم

# ئـیـسـلام

* بۆچی ئەم ئاینە بە ئیسلام ناونراوە؟
* مانای وشەی ئیسلام.
* بنج و بناوانی ئیسلام.
* بنج و بناوانی کوفر.
* زیانی کوفر و ئەنجامی خراپی.
* کەڵکی ئیسلام.

## بۆچی ئەم ئاینە بە ئیسلام ناونراوە؟

هەموو ئایینە جۆربەجۆرەکانی سەر زەوی هەریەکە بەناوی مرۆڤێ وە یا نەتەوەیەکەوە ناونراوە کە ئاینەکە بە هۆیەوە گەشەی کردووەو پەیدا بووە، بۆ نمونە (مەسیحی) بە ناوی مەسیح پێغەمبەرەوە ناونراوە، (بوذیة) بەناوی دانەرەکەیەوە ناونراوە کە (بوزا)یە، ئاینی (زەردەشت) بەناوی زەردەشتەوە ناونراوە، هەروەها (یهودیەت) بەناوی ئەو گەلەوە ناونراوە کە تیا پەیدا بووە و گەشەی کردووە.

بەڵام ئیسلام پەیوەندی تایبەتی بە پیاوێکەوە، وە یا گەلێکەوە نییە چونکە بۆ هەموو کەس و بۆ هەموو گەل و نەتەوەیە یەکسانە، ئەمەش لە مانای وشەی ئیسلام و ئاوەڵناوی ئیسلامەوە وەرئەگیرێ..

بەم پێیە بۆمان دەردەکەوێ کە گەلێ وەیا نەتەوەیە بەتایبەتی نەبووە و نابێ بە خاوەنی ئەم ئاینە و بیکا بەماڵی خۆیو نەتەوەو کەسانی تری لێ بێبەش بکات، چونکە مەبەستی ئەم ئاینە ئەوەیە کە دانیشتوانی ئەم زەوییە پێی جوان و رازاوە بن..

کەواتە هەرکەس و هەر گەلێ ئەم رەوشتەی بریار دا بۆخۆی و ئاوەڵناوی ئیسلامی هەڵگرت ئەوە موسوڵمانە لە رابردوو ئێستاو لەمەولاشدا بێ جیاوازی.

## مانای وشەی ئیسلام

ئەگەر چاوێ بگێری بە فەرهەنگ(قاموس)ەکانی زمانی عەرەبیدا بۆت دەردەکەوێ کە مانای وشەی ئیسلام بریتییە لە (بەگوێکردن و جێبەجێکردنی فەرمانی ئەو کەسەی کە فەرمانت ئەداتێ بەبێ بۆچی و چەن و چۆن).

وە ئەم ئاینەش ناونراوە (ئیسلام) چونکە بەگوێکردنی خوای پەروەردگارەو جێبەجێکردنی فەرمانەکانیەتی بەبێ بۆچی و چەن و چۆن.

## بنج و بناوانی ئیسلام

ئەگەر مرۆڤ بە وردی بیربکاتەوە، بێگومان بۆی دەرئەکەوێ کە هەموو شتێ لەم بوونەوەرەدا شوێنکەوتوی سروشتێکی تایبەتیو یاسایەکی دیاریکراوە، بۆ نمونە: مانگ و خۆرو ئەستێرەکان لەسەر شێوەیەکی نەگۆڕاو و بەپێی یاسایەکی تایبەتی ئەڕۆن کە بە هیچ شێوەیەك لێی لا نادەن، هەروەها زەوی بەدەوری خۆیدا ئەسوڕێتەوە و لەو کات و جوڵان و ڕێگەیەی بۆی دانراوە سەرپێچی ناکات و لێی لانادات. وە هەروەها ئاوو هەوا و رووناکیو گەرمیو هتد. ئەمانەیش لە سەر یاساو دەستورێکی تایبەتی ئەڕۆن و پێچەوانەی ئەو دەستورە . کە بۆیان دانراوە . ناجوڵێنەوە، وشکاییو شینایيو زیندەوەرو دارو درەخت. ئەمانە هەموویان بەگوێرەی یاساو دامودەزگایەك ئەژین و زیادوکەم ئەکەن کە بە هیچ شێوەیەك سەرپێچی لێ ناکەن.

چ جای ئەمانە مرۆڤ خۆیشی ئەگەر جوان بیری لێ بکەیتەوە ئەبینی کە شوێنکەوتوی سروشت و یاسایەکی نەگۆڕاوە، هەناسە ئەداو گەورە ئەبێ بە پێی دەستورێکی دیاریکراو. وە هەروەها دڵی مرۆڤ لە جوڵانیدا ملکەچە هەر بۆ ئەم یاسایە، وە هەموو ئەندامەکانی تری وەکو دەست و پێ و چاوو مێشك و سك و گوێ و زمانی. هەموویان شوێنکەوتووی دڵن وە هەرچی ئیش و کارێ کە ئەم ئەندامانە پێی هەڵدەستن هەموو بە پێی ڕێگاو سنورێکی تایبەتیە کە بۆیان دانراوە.

بەم پێیە ئەم یاسا گشتیيە هەیەو هەموو شتێ لەم بوونەوەرەدا شوێنی ئەکەوێت و ناتوانێ لێی لابدات، هەر لە گەورەترین ئەستێرە لە ئاسماندا هەتا بچوکترین گەردیلە لەم زەویەدا، وە بێگومان ئەم یاساو دەستورە گشتیيەش لە دەستکردو دانانی پادشایەکی گەورەو زاناو بەدەسەڵاتە کە خوای گەورەو پەروەردگارە.

جا، چونکە هەموو شتێ لە زەوی و ئاسماندا ملکەچی یاسایەکی

دیاریکراوه، کەواتە هەموو شتێ فەرمانبەرو گوێڕایەڵی خوای گەورەیەو بەفەرمانی ئەو ئەجوڵێتەوە، وەهیچ شتێ نییە کە بتوانێ سەرپێچی لەفەرمانی ئەو خوایە بکات.

جا لەم روەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە (ئیسلام) ئایینی هەموو شتێکە لەم بوونەوەرەدا، چونکە وەکو وتمان مانای ئیسلام بەگوێکردن و جێبەجێکردنی فەرمانی ئەو کەسەیە کە فەرمانت ئەداتێ، کەواتە رۆژوو مانگ و ئەستێرەو ئاوو هەواو درەخت و شینایی‌و وشکایی هەموویان (مسلم) واتە موسوڵمانن.

وە ئەو مرۆڤەی کە بە هیچ شێوەیە خوای پەروەردگار ناناسێ‌و بڕوای پێی نییە و بگرە ئینکاری ئەکات و شتی تر ئەپەرستێ، یا هاوەڵی بۆ بڕیار ئەدا، ئەمیش هەر (مسلم)ە واتە موسوڵمانە، بەمانای ئەوە کە بەشێکە لەم بوونەوەرەو ئەویش بەپێی ئەو سروشتەی دانراوە شوێنی یاساو دەستورێکی تایبەتی ئەکەوێ‌و لێی لانادا؛ ئەژی؛ گەورە ئەبێ؛ ئەخوات و ئەخواتەوە؛ هەناسە ئەدات؛ هاتوچۆ ئەکات و بە قۆناغی گەنجی‌و پیریدا تێپەڕ ئەبێ، هەمووی بەپێی ئەو یاساو دەستورەی کە خوا بۆی داناوە، لەم رووەوە هیچ ناتوانێ پێچەوانەی فەرمانی خوا بجوڵێتەوە، هەتا ئەو دڵەی کە خۆشەویستیەکی تر، بێجگە لە خوا ئاوەدانی کردووە، یا ئەو دڵەی کە بڕوای بەخوا هەر نییە، ئەویش هەر (مسلم)ە واتە موسوڵمانە، چونکە شوێنکەوتو و ملکەچی یاساو دەستوری خوایە.

بەم پێیە هەموو شتێ لەم بوونەوەرەدا (مسلم)ە واتە موسوڵمانە[1].. کاتێ لەمە تێگەیشتی وەرە با لەروویەکی ترەوە سەیری مرۆڤ بکەین.

مرۆڤ لە ژیانیدا دوو ڕووی جیاوازی هەیە:

یەکەم: ئەوەیە کە شوێنکەوتووی یاسای سروشتە و ناتوانێ لێی لابدا.

---

[1] (وَلَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا) آل عمران/٨٣.
(سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ) الصف/١ وەرگێڕان.

دووەم: ئەوەیە کە بیرو ژیریی و تێگەیشتن‌و ئازادی بیروڕای دراوەتێ.

ئەبینی مرۆڤ بڕوای بە شتێ هەیە و بڕوای بە شتێکیتر نیە، شتێ ئەسەلمێنێ‌و شتێکیتر ناسەلمێنێ، ڕێگاو بیروباوەڕێکی خۆش ئەوێ و بیروباوەڕێکی تری خۆش ناوێ، لە خۆیەوە بەرنامەی ژیان دائەنێ، یا بەرنامەو پرۆگرامێ . کە یەکێکیتر داینـاوە . وەرئەگرێ، وە مرۆڤ لەم ڕووەوە نەبەستراوەتەوە بە یاسایەکی تایبەتیەوە . وەکو دروستکراوەکانی تر. بەڵکو ئازادی و بیرو هەڵبژاردنی دراوەتێ، واتە خۆی سەرپشکە.

وە بێگومان ئەم دوو ڕووە لە ژیانی مرۆڤدا هەیە، هەریەکە بەشێوەی جیاوازو سەربەخۆ. جا لە ڕووی یەکەمەوە هەموو مرۆڤێ (مسلم)ە واتە موسوڵمانە، چونکە شوێنکەوتووی یاسای سروشتەو ناتوانێ بە هیچ شێوەیە لێی لابدا، وەکو هەموو دروستکراوەکانی خوای پەروەردگار.

بەڵام لە ڕووی دووەمەوە خۆی سەرپشکەو هەڵبژاردن بەدەست خۆیەتی، ئەتوانێ موسوڵمان بێ‌و ئەیشتوانێ موسوڵمان نەبێ، وە تەنها ئەم ئیختیارەیە کە مرۆڤ ئەکا بە دوو بەشی جیاوازەوە:

بەشی یەکەم مرۆڤێکە پەروەردگاری خۆی ئەناسێ‌و بڕوای پێی هەیەو ئەزانێ کە ئەو بەخێوی ئەکات‌و پێی ئەگەیەنێ، وەهەر ئەو خاوەنیەتی، بۆیە کردوویەتی بە گەورەی خۆی‌و شوێن یاساو بەرنامە نێرراوەکەی ئەکەوێ، لەو ڕووە ژیانەیدا کە خۆی تێدا سەرپشکە، هەرچۆنێ شوێن یاسای سروشت ئەکەوێ لە ڕووەکەی تری ژیانیا کەوا ئیختیار بەدەست خۆی نیە. وە ئەم مرۆڤە (مسلم)ە واتە موسوڵمانی تەواوە، چونکە ژیانی بەتەواوی شوێنکەوتووی یاساو بەرنامەی خوایە لە هەموو ڕوویەکەوە، ئەم مرۆڤە . بە حەزی خۆی . خۆی داوەتە دەست ئەو خوایەی کە دروستی کردووە، بەم شێوەیە ڕاست ئەبێ لە کردەوەیدا، وە لە زانین و ڕەفتارو قسەکردنیدا، هەر ئەو خوایە ئەپەرستێ کە هێزی زانین‌و تێگەیشتنی پێبەخشیوە. لەگەڵ ئەم

بوونەوەرەدا پەیوەندی ناسین و نزیك بوونەوەی هەیە.

وە مرۆڤ بەم شێوەیە جێنشینی خوایە لەم زەویەداو هەموو شتێ بۆ ئەو دروستکراوەو ئەویش بەندەی خوای پەروەردگارە.

## بنج و بناوانی کوفر

لە بەرامبەری ئەم مرۆڤە کە ئێستا باسمان کرد مرۆڤێکی تر هەیە بە موسوڵمانی لە دایك بووە، و بە موسوڵمانی ئەژی بە درێژایی تەمەنی، بەڵام هێشتا هێزی بیرو زانینی خۆی نەخستوەتە کار بۆ ناسینی پەروەردگاری خۆی، ئەو پەروەردگارەی کە لە نەبوونەوە هێناویەتی بۆ بوون، وە چاوو گوێ و بیرو هەستی پێ بەخشیوە، لەگەڵ ئەوەشا ئینکاری پەروەردگاری خۆی ئەکات و بەرزتر خۆی رائەگرێ لە پەرستنی، وە هەرگیز پەیڕەوی فەرمانی نێراوی ئەو خوایە ناکات، ئا ئەم مرۆڤەیە کە پێی ئەڵێن (کافر) واتە خوانەناس چونکە (کفر) مانای پەردەیە، ئەم مرۆڤەیش پەردەیەکی رەشی داوە بەسەر بیرو هەستی خۆیدا، بۆیە پەروەردگاری خۆی لێ وون بووەو نایناسێ، لەبەر ئەوە هەموو جۆرە جوڵان و هەوڵدان و تێکۆشانێکی پێچەوانەی فەرمانی خوایەو بە هیچ شێوەیە لەگەڵ سروشتی ئەم جیهانەدا رێك ناکەوێ و ناگونجێ، وە ئیتر لێرەدا خۆت بیربکەرەوە ئەزانی ئەم مرۆڤە تا چ رادەیە لە گووم بوون و وێڵ بوونێکی گەورەدایە.

## زیانی کوفرو ئەنجامی خراپی

(کفر) نەفامی و نەزانینە، وە بگرە نەفامی و نەزانینی راستەقینە (کفر)ە واتە خوانەناسینە.. چ نەفامی و نەزانینێ ناخۆشترو خراپترە لە نەفامی کەسێ کە خوای خۆی نەناسێ؟!

چۆن مرۆڤ ئەم کارگە جیهانە مەزنەی جیهانی بەرچاو ئەکەوێ و ئەبینێ شەوو رۆژ لەکاردایەو ناوەستێ و پشوو نادات، وە خوای گەورە پێی

راگەیاندووە کە بەم شێوەیە بەردەوام بێ لەسەر ئیش و کاری خۆی..

چۆن مرۆڤ ئەم هەمووەی بەرچاو ئەکەوێ لەگەڵ ئەوەشدا بڕوا بەو کەسە ناکات کە دروستی کردووەو پێی راگەیاندووە کە پێویستە بەم شێوە رێك و پێکە لەسەر ئیش و کاری خۆی بڕواو بەردەوام بێ؟ وە چۆن نابێ بزانێ کێ وا مرۆڤی دروست کردووە لەم هەموو تەنە جۆربەجۆرانە، وەکو: هایدرۆجین و ئۆکسجین و گازی غەڵووزو ئازۆت و سۆدیۆم و کالسیۆم و گەلێ شتی تر لەو تەنانەی کە نە ژیان و نە ژیری بێ ئەوانە پێك نایەت؟.

بەم جۆرە ئا لەم تەنانە خوای گەورە زیندەوەرێکی گەورەی وەك ئادەمیزادی دروست کردووە.. ئایا چۆن مرۆڤ سەرسام نابێ لە کاتێکدا کەمێ ورد ئەبێتەوە لەم هەموو شتە جۆربەجۆرانەی جیهان کە دروستکردنی هەریەکەیان پێویستی بە شارەزاییەکی تەواو هەیە لە زانیاری ئەندازەو بیرکاریو کیمیاو زانیاریەکانی تریشدا..

بێگومان، دوای بیرکردنەوەیەکی راستەقینە، مرۆڤ بۆی روون دەبێتەوە کە هەریەکە لەم زەویو ئاسمان و ئادەمیزادو زیندەوەرو دارو درەختانە پێویستی بە خوایەکی زاناو بەدەسەڵات هەیە کە لە پێشەوە نەخشەی کێشابێ و بەم جوانی و رێك و پێکیە دروستی کردبێ..

خوانەناسین (کفر) تاوانە، بگرە گەورەترین و خراپترین تاوان خوانەناسین و بێئاینیيە. چونکە مانای تاوان دانانی شتە لە شوێنێکدا کە جێگای خۆی نەبێ. وە بەکارهێنانیەتی بە زۆر لە جێگایەکدا کە لەگەڵ سروشتی ئەو شتەدا ناگونجێ.

بێگومان زانیمان کە هەرچی لەم زەوی و ئاسمانەدا هەیە فەرمانبەری خوای گەورەیەو سەرپێچی ناکا لەو یاسایەی کە لە سروشت بۆی داناوە، خۆ ئەو کەسەی کە بڕوای بە خوا نیيە بە شێوەیە لەم ژیانەدا ئەجوڵێتەوە کە لەگەڵ سروشتی خۆی و ئەو بوونەوەرەدا ناگونجێ، دڵی بە خۆشەویستی یەکێ یان

شتێ ئاوەدان ئەكاتەوە كە وەكو خۆیەتی یان لە خۆی نزمترە، ئەندامەكانی لەشی وەكو دەست و قاچو مێشكو چاو لە پێچەوانەی فەرمانی خوادا بەكاردەهێنێ.

توخوا پێم بڵێ كێیە تاوانبارتر بێ لەكەسێ كە نارەوایی و تاوان دەربارەی خۆی و هەموو شتێ لەم بوونەوەرەدا ئەكا، ئەویش لەبەر ئەوە چونكە بە پێچەوانەی یاسای ئەم بوونەوەرە رەفتار ئەكاو ئەجوڵێتەوە، دیارە لەو رووە ژیانەیدا ئەڵێن مافی سەرپشكی دراوەتێ.

خوانەناسین تەنها تاوان نییەو بەس، بەڵكو دەستدرێژیو نەفامیو بێشەرمیشە. ئایا كێیە بیرو مێشكی داوە بە مرۆڤ؟ خۆیەتی یان خوا؟ كێیە دڵو زمانی داوەتێ؟ خۆیەتی یان خوا؟ كێیە دووچاوو دوو دەست دوو گوێو دوو پێی داوەتێ؟ خۆیەتی یان خوا؟ كێیە ئەم هەموو شتەی بۆ ئادەمیزاد دروستكردووەو. وای لێكردووە كە ئەتوانێ بۆ بەرژەوەندی خۆی بەكاریان بێنێ؟ خۆیەتی یان خوای گەورەو میهرەبانە؟!

دیارە ئەبێ وەڵامی ئەم پرسیارانەت ئەوەبێ كە هەموو ئەم شتانە بەدەست خوای گەورەیەو بەس، هەر ئەوە بەم شێوە جوانو ناوازەیە دایمەزراندووە و رێكوپێكی كردووە. بە شێوەیە كە ئامادەبێ بۆ سوودو بەرژەوەندی مرۆڤ لەم ژیانەدا.

زۆر بە ئاسانی، بێشەرمیو نەفامیو تاوانباری ئەدەی بەسەر ئەو بەندەیەدا كە بە رۆژی ئاغاكەی پێگەییبێو كەچی ئاغاكەی ناناسێو مافی جێبەجێناكا، وە هەروەها ئەو مووچەخۆرەی كە بەپێی بەرژەوەندی میری ناجوڵێتەوەو گوێ ناداتە فەرمانەكانی، زۆر بە ئاسانی لە یاسا دەرچوون و یاخیبوونی ئەدرێ بەسەردا، لەگەڵ ئەوەشا ئەم یاخیبوون و لە یاسا دەرچوونە بەراورد ناكرێ لەگەڵ یاخیبوون و لەیاسا دەرچوونی خوای

پەروەردگار.[2]

چونکە بەخشندەکانی خوا بۆ بەندەکانی وەکو بەخشندەو موچە دانی ئادەمیزاد بۆ ئادەمیزاد نی‌یە، نابینی گەورەترین و باشترین کەس لێرەدا کە شایانی فەرمانبەری‌و سوپاس بێ بریتی‌یە لە دایك و باوك، کەچی هێشتا ئەمانیش ناگەنە رادەی خوای گەورەو پەروەردگار لە مافی فەرمانبەری‌و سوپاس کردندا، چونکە ئەی ئەوکەسە کێیە کە هەستی بەزەیی‌و خۆشەویستی خستوەتە ناو دڵی دایك‌و باوکەوە؟ جا ئیتر هەستت چۆنە بەرامبەر بەندەیەك کە خوای گەورە لە نەبوونەوە هێناویەتیە بوون، وە ئەم جیهانەی بۆ رازاندوەتەوە و هەموو شتێکی ئەم زەوی‌و ئاسمانەی بۆ ژێربار کردووە، هەروەها ژیری و بیرکردنەوەی پێ‌بەخشیوە، بۆ ئەوەی بە کاریان بێنێ بۆ سوود وەرگرتن لەم هەموو شتانە، وە چەندەها بەخششی‌تر کە لە ژمارە نایەن.[3]

پێم بڵێ: ئایا کێ هەیە لەم بەندەیە سپڵەترو تاوانبارترو بێ‌شەرمتربێ؟ یا چ تاوانێ هەیە لەتاوانی وا گەورەترو خراپتربێ؟ وە هەرگیز وایش مەزانە کە ئەگەر مرۆڤ خوانەناس بێ هیچ زیانێ بە خوای گەورە ئەگات، بەڵام ئەمەی کە خوای گەروە لە مرۆڤی داوا ئەکات تەنها بۆ سوودی مرۆڤ خۆیەتی و بۆ ئەوەیە کە ژیانی مرۆڤ رێك‌وپێك بێ.

یەکێکی‌تر لە بەرهەمەکانی بێ‌ئاینی‌و لە خوا یاخی‌بوون ئەوەیە کە زیانێکی هەمیشەیی‌و نەبڕاوە بۆ مرۆڤ ئەبڕێتەوە؛ هەرگیز رێی ناکەوێ لە زانیاریەکی بەکەڵك، ئەگەر لەوانە بوو شتێکی بەکەڵکی دۆزیەوە لەباتی ئەوەی لە جێگەی خۆیدا . کە سوودی مرۆڤە . بەکاری بێنێ، ئەبینی لە خراپەو رووخاندن و

---

[2] مەبەست لێرەدا تەنها دەرچوون و یاخی‌بوونەکەیە ئایا ئەم هەڵوێستانە بە دەرچوون و یاخی‌بوون دانانری؟ وە مەبەست ئەوە نی‌یە کە دەرچوونەکە راست بێ یان نا؟ چونکە جاری وائەبێ هەڵوێستەکە راست و جێی خۆیەتی. (وەرگێران)

[3] (وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لاَ تُحْصُوهَا) ابراهيم/٣٤ وەرگێران

ژێرپێ خستنی مافی مرۆڤدا بەکاری دێنێ، چونکە ئەو زانیاریەی کە پەروەردگاری خۆی پێ ناناسێ، چۆن شتێکی بەکەڵکی پێئەدۆزێتەوە؟! ئەو ژیری و تێگەیشتنەی کە خوای پێناناسێ هەمیشە پاڵی پێوە ئەنێ بۆ هەموو کارێکی خراپ و ناپەسەند لە هەموو شێوەیە لە شێوەکانی ژیانیدا، رەوشت و خوی جوانی هەمیشە لەبیری ئەوەدایە کە خۆی زل بکات و بەسەر مەردمدا کەش و فش بکات، دەست ئەداتە کوشتار و خوێن رشتن لە پێناوی ئامانجی ناپەسەندی خویدا، بەم شێوەیە ژیانی خۆی تاڵ ئەکات و مەردمێکیش تووشی گیروگرفت و ناخۆشی ئەکات، ئەمە، لە ژیانی ئێستادا، لە ژیانی دواییشدا هەموو شتێکی لێ راست ئەبێتەوە و لە دادگای خوادا شایەتی خراپی و نالەباری لەسەر ئەدەن، ئەندامەکانی لەشی هەموو لێی دێنە زمان و سکاڵای ئەگەیەننە دادگای پەروەردگار و ئەڵێن: خوایە! ئەم تاوانبارە لە ژیانی جیهاندا لێت یاخی بوەو ئێمەی بەکارهێناوە لە تاوان و دەستدرێژیدا، هەروەها هەموو شتێکی ئەم زەوی یە کەبەسەریدا رۆیوەو خراپەو ناڕەوایی تێدا کردووە ئەبینێ، لەم دادگا گەورەیەدا کە جێگای بەرتیل وشتی وای تێدا نی یە وا هەمووی لێ هاتوەتە زمان و شایەتی لەسەر ئەدەن، ئەو ماڵ و سامانەی کە لەرێگای ناڕەواو دەستدرێژیەوە کۆی کردەوەتەوە و لە خراپەدا خەرجی کردووە هەموو لێی دێنە زمان و شایەتی لەسەر ئەدەن و ئەو هەموو ژیری و بەهرەو بەخششانەی کە ئەبوایە لە جێگای چاک و بەسودا بەکاری بهێنایا، هەموویان لە دژی کۆئەبنەوەو هەریەکە توانجێکی تێئەگرن و گلەیی خۆیانی لێ ئەکەن، بەم جۆرە لەم دادگایەدا تووشی سزاو ئازاری ئەکەن، لە تۆڵەی ئەم هەموو دەستدرێژی و ناڕەواییانەدا کەلە جیهانی ژیاندا کردویەتی.

## کەڵکی ئیسلام

ئەمەی کە باسمان کرد، زیانی خوانەناسی و بێئاینی(کفر) بوو، با ئێستا لەوە بکۆڵینەوە بزانین سودو کەڵکی ئیسلام چییە وا ئێمە بڕوامان پێکردووەو پەیڕەوی یاساو دەستورەکەی ئەکەین؟

بێگومان لە پێشەوە تێگەیشتین کەئەم بوونەوەرە پڕیەتی لە بەڵگەو نیشانەی گەورە گەورە کە هەریەکەیان بەسە بۆ ئەوەی بەڵگەبێ لەسەر خوایەتی و یەکێتی خوای گەورەو پەروەردگار چونکە ئەم کارگە گەورەیە کە بەم شێوەیە بێپشوو بەردەوام لەسەر ئیشوکاری خۆی ئەڕوا بە جۆرێکی رێكوپێك و یاسایەکی دیاریکراو. ئەمە بە زمانی حاڵ شایەتی ئەدا کە دانەرو رێکخەرەکەی خوایەکی گەورەو بەهێزو زانایە کە هیچ شتێ ناتوانێ لە فەرمانی بچێتە دەرەوە، وەهەروەها ئەوەیش تێگەیشتین کە ئادەمیزادیش هەروەکو ئەندامەکانیتری ئەم بوونەوەرە شوێنکەوتووی یاسای سروشتەو شەوو رۆژ فەرمانبەری ئەم یاسایە ئەکا بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێ، وە هەرگیز ناتوانێ پێچەوانەی یاسای سروشت رەفتار بکاتو بجوڵێتەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە خوای گەورە شتێکی جیاوازو تایبەتی بە مرۆڤ بەخشیوە کە بە هیچ شتێکیتری نەبەخشیوە لەم بوونەوەرەدا، کە ئەویش بریتییە لە ئازادی هەڵبژاردن (حرية الاختيار) وە هێزی زانینو بیرکردنەوەی پێبەخشیوە کە ئەتوانێ چاكو خراپ لەیەك جیا بکاتەوە.

بەم پێیە مرۆڤ ئەبێ تاقی بکرێتەوە وە هەمیشە لەبەردەمی تاقیکردنەوەی خوای گەورەدایە، تا بزانرێ ئەم زانیاری و بیرەی خۆیە چۆنو لە چیدا بەکارئەهێنێ؟

وە بێگومان زۆری لێ نەکراوە کە لەم تاقیکردنەوەیەدا شوێنی پرۆگرامێکی تایبەتی و دیاریکراو بکەوێ. چونکە ئەو کاتە تاقیکردنەوەکە بێکەڵك ئەبێ، وەئەمەیەش شتێکی دیارو ئاشکرایە، بێگومان ئەگەر تۆ پرسیارەکانی

تاقیکردنەوەت دراوەتە دەستو زۆرت لێکرا کە وەڵامێکی زانراوی دیاریکراو بدەیتەوە، ئایا ئەبێ چ کەڵكو سوودێ لەو تاقیکردنەوەدا هەبێ؟!

بێگومان رادەی پلەی زانیاری تۆ بە هیچ شێوەیە بەم جۆرە تاقیکردنەوەیە دەرناکەوێ، بۆیە پێویستە سەربەستو ئازاد بیت لە وەڵامدانەوەدا. جا ئەگەر وەڵامەکەت راست بوو ئەوا لە تاقیکردنەوەکەدا دەردەچیتو دەرگای پێشکەوتنو سەرکەوتنت لێ‌ئەکرێتەوە، وە ئەگەر وەڵامەکەت راست نەبوو ئەوا لە تاقیکردنەوەکەدا ئەکەویت و دەرگای سەرکەوتنو بەختیاری پاشەڕۆژت لێ دائەخرێ. بەم شێوەیە خوای گەورە ئازادی تاقیکردنەوەی بە مرۆڤ بەخشیوە تا بزانرێ خۆی کام رێگا ئەگرێ لە ژیاندا.

ئینجا لێرەدا مرۆڤی وا هەیە سروشتی خۆیو ئەم بوونەوەرە ناناسێ، بەهەڵەدا ئەچێ لە ناسینی خوداو ئاوەڵناوی خوادا، لەبەر ئەوە رێگای خراپەو تاوان ئەگرێ، و لەو ئازادی بیروباوەڕە کە پێی بەخشراوە ناتوانێ کەڵك وەرگرێ، بۆیە لە تاقیکردنەوەی زانیاری هێزی جیاکردنەوەی چاکەو خراپەدا دەرناچێ و ئەکەوێ وە ئیتر پاشەرۆژێکی تاریكو بێ‌نرخ بۆ خۆی ئەبڕێتەوە.

مرۆڤێکی‌تر هەیە کە لەم تاقیکردنەوەیەدا دەرچووە، بیری خۆی خستوەتە کارەوەو بە جوانی کەڵکی لەو ژیریی و زانیاریو تێگەیشتنە وەرگرتووە کە پێی بەخشراوە لەبەر ئەوە پەروەردگاری خۆی ئەناسێ و بڕوای پێی هەیە، بێ ئەوەی زۆری لێبکرێ، هەروەها لە جیاکردنەوەی چاکەو خراپەدا بەهەڵەدا نەچووە و رێگای چاکەی گرتوەتە بەر، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەتوانێ رێگای خراپە بگرێتەبەر بەڵام بەبڕواو ئارەزووی خۆی یەکەمیانی بەچاك هەڵبژاردووە.

با لێرەدا لەوە بکۆڵینەوە کە چ شتێکە ئەم مرۆڤەی لە تاقیکردنەوەدا دەرچوواندووە؟ بێگومان، ئەم مرۆڤە ژیریی خۆی خستوەتە کارەوەو بە جوانی کەڵکی لە بەخششی چاوو گوێو مێشکی وەرگرتووە، وە لە هەرچی وتارو کرداردا ئاراستەکانی بۆخۆی پەسەندکردووە، زۆر باش . بەبەڵگەوە .

تێگەیشتووە کە ئەبێ هەر خوا بناسێ و تەنها شوێنی دەستورو یاسای ئەو بکەوێ لە کردارو رەفتاریدا، وە کەمەری پەرستن و بەگوێکردنی هەر بۆ خوا بەستوەو بەس. ئیتر چۆن ئەبێ سەرت سورپمێنێ کاتێ کە ئەبینی لە تاقیکردنەوەدا دەرچووەو هەموو هەنگاوێکی راستەو ئەتوانێ زۆر بە باشی لە نهێنی و شاراوەکانی ئەم بونەورەدا تێبگا و هەمیشە لە زانیاری و تێگەیشتنی ئەم سروشتەدا هەر لە پێشکەوتن و سەرکەوتندابێ.. رۆژ بەرۆژ بڕوای بەخاوەنی ئەم بوونەوەرە پتەوترو بەهێزتر دەبێ و زیاتر زاڵ ئەبێ بۆ دۆزینەوەی باشترین رێگا لە پێناوی کەڵك وەرگرتن لەو هەموو شتانەی کە خوای گەورە داینـاوە بۆ مرۆڤ لەم زەوی و ئاسمانەدا، بەمەرجێ خواناسین و هەستی رۆژی دوایی هەمیشە بەرگری ئەوەی لێ ئەکەن کە خۆی بە خاوەنی ئەم شتانە بزانێ و دەست بداتە یاخیبوون و لە خۆبایی بوون، وە ئەو زانیاریەی کە مرۆڤ پێی بەخشراوە هەرگیز بەکاری ناهێنێ لە داگیرکردن و یاخیبوون و ئاژاوە نانەوەدا بەبیانووی بەرژەوەندی تایبەتی خۆی یان وڵاتەکەی.

بە بیرکردنەوەیەکی کەم، تێئەگەی کە هەرچی نالەباری و ناخۆشی و ئاژاوەو داگیرکردن هەیە ئێستا لە جیهاندا هەمووی کردەوەی زانای خوانەناسە.

بەڵام زانای خواناس و خاوەن بڕوا هەتا زانیاری و لێکۆڵینەوەی زیاتر بێ و باشتر لە نهێنی ئەم سروشتە تێبگا بڕوای بەخوا زیاترو پتەوتر ئەبێ..

ئەم هەستەش هەمیشە پاڵی پێوە ئەنێ کە زانیاریەکەی بۆ سوودی گشتی بەکاربێنێ، نەك بۆ داگیرکردن و رووخاندنی ژیانی مرۆڤایەتی. هەروەها هەرگیز لە تێکۆشان و هەوڵدان لە پێناوی زانیاری مێژوو ئابوری و یاساو رژێمدا ماندوو نابێ و دوا ناکەوێ، تەنها ئەوەندە هەیە جیاوازیەکی زۆر گەورە هەیە لە نێوان بیرکردنەوەی زانای خواناس و زانای بێبڕوادا، ئەویش بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

زانای خواناس، هەموو جۆرە زانیاریەك تێئەگاو لێی ئەکۆڵێتەوە بە بیرێکی

پاك‌و بۆ مەبەستێكی پیرۆزو بێگەرد، بۆ نمونە لە مێژوودا لەسەرگوزەشتەو رووداوەكان‌و لێكۆڵینەوەی رابردوو پەندو ئامۆژگاری بەنرخ وەرئەگرێ، و هۆی راستی بۆ سەركەوتن یا رووخانی میللەتانی رابردوو تێئەگا و هەوڵ ئەدا بۆ تێگەیشتنی ئەوەی كە بەكەڵك بێ لە شارستانی‌و رۆشنبیری پێشوەكاندا، و خۆی لەو شتانە ئەپارێزی كە بوون بە هۆی لەناوچوون‌و بڕانەوەی دەسەڵاتی میللەتانی رابردوو.

لەبەشی ئابوریدا هەمیشە هەوڵ ئەدا بۆ بەرهەمهێنانی سامانێكی پاك‌وخاوێن، وە دابەشكردنی بە شێوەیەك كە سوودەكەی هەموو كەس بگرێتەوە، بەبێ‌جیاكردنەوەی هەندێ لە هەندێكی‌تر.

لەبەشی رامیاریدا هەمیشە هەوڵ ئەدا كە هێمنی‌و ئاسایش سەر زەوی بگرێتەوە. نەك بۆ ئەوەی كە مەردم بكا بەبەندەی خۆی، یا بیانكات بە بەندەی ئەو میللەت‌و گەلەی كە خۆی یەكێكە لە ئەندامەكانی، چونكە بڕوای وایە كە دەسەڵات‌و فەرمان سپاردەیەكی خوای گەورەن دراونەتە دەستی كە بەكاریان بێنێ بۆ بەختیاری بەندەكانی خوا.

لەبەشی یاسا و رژێمدا هەمیشە تێئەكۆشێ بۆ ئەوەی كە مافی هەموو كەس جێبەجێ ببێ و هەموو كەس هەستێ بەو ئەركەی كە كەوتوەتە سەرشانی بەوپەڕی دادپەروەری‌و دەستپاكی‌یەوە، بۆئەوەی بە هیچ شێوەیە كەس دەستدرێژی نەكات بەسەر كەسی‌تردا.

هەروەها راستی‌و پاكی‌و بێزیانی و لەخواترسی‌و شوێنكەوتنی راستی، ئەمانە هەموویان شێلراون بە رەوشتی موسوڵمانەوە، كاتێ لەم جیهانەدایە ئەزانێ خاوەنی ئەم بوونەوەرو دام‌و دەزگایە هەرخوایە وەزۆر باش ئەزانێ ئەوەی كە خۆی هەیەتی‌و ئەوەیش لای كەسانی‌ترەو هەمووی خوا خاوەنیەتی بەبێ جیاوازی، ئەزانێ هەرچی هەیە لەهێزی دەست‌و چاوو پێ‌و گوێ‌و مێشك‌و زانیاری‌و بیرو دەسەڵات هەموو سپاردەی خوای پەروەردگارە، ئەبێ

بەشێوەیە بەکاربێن کە خاوەنی راستییان فەرمانی داوەتێ و پێی خۆشە، نەك بە ئارەزووی خۆیو بۆ سوودی تایبەتی گەل یا کۆمەڵەکەی خۆی، چونکە ئەزانێ لە دواییدا خوای گەورە ئەم سپاردانەی لێ وەرئەگرێتەوەو گەورەترین لێپرسینەوەی لەگەڵ ئەکات.

جا ئاورێ بدەرەوە بەلای خۆتاو کەمێ لە رەوشتی ئەم مرۆڤە وردببەرەوە ئەبینی دڵی پاك رائەگرێ لە گومان بردن، مێشکی دوورئەخاتەوە لە داڵغەی خراپ، چاوی لائەدا لە نواڕینی بێسوودو هەڵە، زمانی ئەگرێ لە وتنی شتی پڕوپوچ و شورەیی، حەزئەکات لە مردنی خۆی نەك پارویەکی حەرام بچێتە ناو سکی، نایەوێ دەستدرێژی بکا بۆ داگیرکردنی مافی کەسانی تر، هەنگاوی ئەگرێ لەوەی کە بڕوات بۆ خراپەکاری، سەرشۆڕ ناکا لە ئاستی یاسای ناڕەواو شتی ناڕاست گەرچی بشیکوژنو پارچەپارچەی کەن.

خۆشەویسترین شت لای ئەو بریتییە لە دادپەروەریو راستگۆییو دەستپاکی، و خراپترین شت لای بریتییە لە تاوانو ستەمکاریو دەستو داوێن پیسی. لە دونیادا لەم مرۆڤە گەورەترو بەشەرەفترو بەرزتر نییەو دەست ناکەوێ، چونکە بۆ خوا نەبێ بۆ هیچ کەس و هیچ شتێکیتر ملی کەچ ناکاو دەستی بۆ درێژ ناکات، و هیچ کەس نییە لەم مرۆڤە بەهێزتر بێ، چونکە ترسی نییە لەخوا نەبێ، و بەهیچ شتێکەوە هیواو ئامانجی نەبەستووە بەخواوە نەبێ، دەی ئیتر چ هێزێکیتر هەیە کە بتوانێ لە ڕێگای راست لایبداتو سەرمایەی بڕوای لێ بسێنێتەوە؟.

لە جیهاندا یەکێ تر نییە کە لەم مرۆڤە دەوڵەمەندترو ساماندارتر بێ، چونکە خۆی نەکردووە بە دڕندەو بە هەموو لایەکدا پەلاماری ناڕەوا بدا، و نەبووە بە بەندەی هەوەسو ئارەزووی خۆی، بەوەی کە بەهەوڵو کۆششی خۆی دەستی ئەکەوێ دڵنیاو پێخۆشحاڵە، چاوچنۆك نییە بۆ سامانی (حرام)، وە داگیرکردنی مافی کەسانیتر بە زۆر یا بەفێڵو تەڵەکەبازی. ئەمەیە

سامانی (قەناعەت) کە لە دنیادا لە هەموو سامانێ باشترو بەنرخترە.

وە لە جیهاندا کەسێ نی‌یە لەم مرۆڤە خۆشەویستتر بێت لە دڵی مەردمدا، چاکەیان لەگەڵ ئەکاو خراپەیان لەگەڵ ناکات، بۆ بەختیاریان تێئەکۆشێ بێ‌ئەوەی پاداشتی لێیان بوێ، ئەمانەش هەموو جۆرە شتێکن کە ئەبنە هۆی خۆشەویستی و لە دڵی مەردمدا هەر ئەمێننەوەو بۆیە ئەبینی مرۆڤی موسوڵمان کە کاتێ ئەمرێ ئینجا لە دڵی مەردمدا گەورەترو خۆشەویستتر ئەبێ، پێچەوانەی مرۆڤی خوانەناس، لە ژیاندا کەمێ رێزی ئەگیرێ و لە چەند دڵێکی کەمدا جێگای خۆی کردەوەتەوە، بەڵام کە مرد ئەوانەیشی نامێنێ، ئیتر بەجارێ ئەمرێ و ناونیشانی کوێر ئەبێتەوە! هەروەها کەس نی‌یە لە جیهاندا ئەوەندە باوەڕپێکراو بێت، چونکە بەچاکی لەگەڵ مەردما ئەژیو ئەجوڵێتەوە، پەیمانیان جێبەجێ ئەکات، راستی و دەستپاکیەکەی بە هیچ شتێ ناگۆڕێتەوە، بۆیە ئەبێتە جێگای بڕوای مەردمو هەموو پرسو رایەکیان ئەبەنە لای ئەو.. ئەگەر بە جوانی لە رەوشتی مرۆڤی موسوڵماندا لەم نمونە تێگەیشتی ئەوکاتە بۆت روون دەبێتەوە کە مرۆڤی وا لەم جیهانەدا هەمیشە سەربەرزو بەختیارە و هەرگیز نزمی و بێئابڕویی و شتی وا رێگای ناکەوێتە لای ئەم جۆرە مرۆڤانە.

ئەمەی کە وتمان پاداشتی مرۆڤی خاوەن بڕواو موسوڵمانە لەم جیهانەدا، و لە رۆژی دواییشدا خوای گەورە ئەیخاتە سێبەری بەزەیی خۆیەوە، و لەناو بەهەشتی پانو بەرینی خۆیدا دائەنێ، ئەو بەهەشتەی کە مەگەر بە نموونەی ئەم جیهانە بتوانین کەمێکی تێبگەین، ئەگینا شوێنێ کە خوای گەورە بە تایبەتی بۆ رابواردن ئامادەی بکا ئەبێ چۆن بێ؟ هەر ئەبێ لە ژوور بیرکردنەوەی ئێمەوە بێ[٤].

ئەوەی وتمان ئەوەیە کە ئاینی (ئیسلام) ئاینی هەموو مرۆڤە، بگرە ئاینی

---

[٤] (فلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ) السجدة:١٧.
(فيها مالا عين رأت ولا أذن سمعت ولا خطر على قلب بشر). متفق عليه (وەرگێران)

سروشــتە لــەم جیهانــەدا، وە ئــەم ئاییـنــە تایبــەتی نیـیــە بــۆ نەتەوەیــەكو نەتەوەیەكیتری لێ بێبەش بێ، یان بۆ چینێكو چینێكیتری لێ بێبەش بێ، یان بۆ ناوچەیەكو نەك ناوچەیەكیتر، یان بۆ چەرخێكو نەك چەرخێكیتر، بەڵكو ئایینی هەموو كەسێكە كە خوای پەروەردگار بناسێو شوێنی یاساو دەستوری ئەو بكەوێو رێبازی ئەو بگرێو بەس، ئیتر لەهەر كاتو چەرخو ناوچەیەكدا بێت، و بەهەر زمانێ لە زمانی نەتەوەكەی خۆی ناوی ئەم ئایینە بباو بیناسێ، بەكوردی یان عەرەبی بە فارسی یان توركی، بە ئینگلیزی یان فەرەنسی هتد.

## بەشی دووەم

# بڕواو بەگوێکردن

* مرۆڤ لە کاتی بـەگوێکردن و فەرمانبـەریدا پێویسـتی بـە زانین و بڕوای تەواو هەیە.
* مـانـای بـڕوا.
* بەچ هۆیە ئەتوانین بگەینە زانین و بڕوای تەواو؟.
* بڕواکردن بە نهێنی و شاراوەکان.

## مرۆڤ لەکاتی بەگوێکردن و فەرمانبەریدا پێویستی بە زانین و بڕوای تەواو هەیە

لە پێشەوە زانیمان کە (ئیسلام) بریتی‌یە لە فەرمانبەری خوای پەروەردگارو ملکەچی بۆ فەرمان‌و بڕیارەکانی، وە لێرەدا ئەمانەوێ باسی ئەوەت بۆ بکەین کە مرۆڤ ناتوانێ بە گوێی فەرمانەکانی خوا بکات‌و شوێنی ڕێبازو بەرنامەکەی بکەوێ، هەتا هەندێ شت هەیە بە جوانی ئەبێ بیزانێ‌و تێی بگات بە شێوەیە کە گومانی تێدا نەمێنێ.

یەکەم شتێ کە لێرەدا مرۆڤ پێویستە بیزانێ ئەوەیە کە دڵنیا بێ و بڕوای تەواوی ببێ بە (بوونی خوای پەروەردگار)، هەروەها پێویستە کە ناوەڵناوەکانی خوای گەورە بناسێ، چونکە ئەگەر تێ نەگا کەخوا تاک‌و تەنیایەو لە خوایەتی‌دا هاوبەشی نی‌یە، چۆن خۆی ئەپارێزی لە بەگوێکردن‌و پەرستنی یەکێ یا شتێکی تر کە شایانی پەرستن نی‌یە؟ هەروەها ئەگەر نەزانێ کە خوا هەموو شتێ ئەبیسێ‌و ئەزانێ وە هەموو شتێك ئەبینێ، چۆن خۆی ئەگێڕێتەوە لە تاوان‌و دەرچوون لە فەرمانی خوا؟ تەنها زانینی رووتیش بەس نی‌یە، بەڵکو پێویستە لە قوڵایی دڵیا جێگیر ببێ‌و تێکەڵی خوێن‌و مۆخی ببێ، بە شێوەیە کە پێچەوانەی زانینەکەی نەجوڵێتەوە، دوای ئەوە ئەبێ بزانێ ڕێگای ڕاست کامەیە بۆ ئەوەی ژیانی خۆی بەپێی ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بەسەر بەرێ، کەواتە پێویستە بزانێ کە خوا چی پێ‌خۆشە بۆ ئەوەی بیکا، وە چی پێ‌ناخۆشە بۆ ئەوەی لێی دووربکەوێتەوە، بۆیە پێویستە کە یاسای خوا بناسێ‌و بڕوای تەواوی ببێ کە ئەم یاسایە لەلایەن خواوە هاتووە، وەئەبێ بزانێ کە هەر ئەم یاسایە شایانی بەگوێکردن‌و شوێنکەوتنە، وە هیچ یاسایەکی‌تر نی‌یە کە وەکو ئەو بێ یان لەو باشتر بێ لە ڕاستی‌و دروستیدا، بۆ ئەوەی بە پشو بێ لەسەر بەگوێکردن‌و هەرگیز لێی لانەدا.

وەئەبێ زۆر چاك بزانێ کە دواڕۆژی چی‌یە ئەگەر ڕێگای گوناهو تاوانباری

بگرێو واز له ڕێگا ڕاستەکەی خوا بێنێ، لەبەر ئەوە پێویستە دڵنیاییو بڕوای تەواوی ببێ بە ڕۆژی دوایی، واتە بڕوای ببێ بە ژیانو جیهانێکیتر جگە لەم ژیانو جیهانەی کە ئێستا تێیدایە وەئەبێ زۆر چاك بزانێ کە لەم ڕۆژی دواییەدا لەبەردەم خوای گەورەدا ڕائەوەستێنرێ و هەموو کردەوەکانی ئەخرێتە پێش چاو، جا ئەگەر چاکەی کردبوو پاداشتی بەچاکەیە، وە ئەگەر خراپەی کردبوو تۆڵەی لێ ئەسێنرێ. وە ئەبێ ئەم زانینەشی بگاتە پلەی بڕوای تەواو و لای ئاشکرابێ، بە شێوەیە هیچ گومانی تێدا نەبێ.

## مانای بڕوا

ئەوەی کەلە پێشەوە ناومان برد بە زانینو تێگەیشتن، ئەوەتا مانای (بڕوا) واتە (ایمان). هەرکەسێ لەمانای (خوا بەیەك زانین) بە جوانی تێبگاو ئاوەڵناوەکانی خوای گەورە بە ڕێكوپێکی بزانێ، وە بزانێ یاسای خوا چییە بۆ پاداشتی کردەوەکانی بەندەکان وە لە قوڵایی دڵیدا ئەم بڕوایە جێگیر ببێ.. ئەوکەسە (مؤمن) واتە ئیماندارە، ئەنجامی ئەم ئیمانەش ئەوەیە کە (مسلم) واتە موسوڵمان ئەبێ (مؤمن) واتە ئیماندار بێ، چونکە (ئیمان) وەکو (تۆو) وایە و ئیسلامیش درەختەکەیە، ئایا تۆو سەرچاوەی درەخت نییە؟ وایش ڕێك ئەکەوێ کە (تۆو) ئەکرێتە زەوی لەگەڵ ئەوەشدا درەخت شین ناکات، یان شینی ئەکات بەڵام لەگەڵ هەندێ ناتەواویدا، ئەوەش لەبەر خراپی زەوی، یا نەگونجاوی هەوایە، هەروەهایش ڕێك ئەکەوێ مرۆڤ لە دڵیدا (ئیمان) واتە بڕوا هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلامیەتەکەی تەواو نییە، بۆچی؟ یان لەبەر ناتەواوی خۆیەتی وەیان لەبەر ئەوەیە کە بەجوانی پەروەردە نەکراوە، وەیا لەبەرئەوەیە کە هاوڕێو دەوروپشتەکەی کاریان تێکردووە.

جا لەبەر ئەوە بەپێی ئەم دوو بنەڕەتە (ئیمانو ئیسلام) مرۆڤ ئەکرێ بە چوار بەشەوە:

بەشی یەکەم: ئەوانەن کە بڕوا ئەهێنن بە خوای پەروەردگار بڕوایەکی وا کە وایان لێ ئەکا هەمیشە شوێنی فەرمانو یاسای خوا ئەکەون بەتەواوی و خۆیان ئەپارێزن لەوەی کە خوا قەدەغەی کردووە، هەروەکو یەکێ خۆی ئەپارێزێ لە پشکۆیەکی گڕدار کە لە دەستیا بیهێڵێتەوە. وە هەروەها زۆر بە پەرۆشەوە پەلامار ئەدەن بۆ کردەوەی باش، بە شێوەیەك کە پەروەردگار پێی خۆش بێ، هەروەکو یەکێ هەوڵ ئەدات بۆ دەستخستنی ماڵو سامان، ئەمانەن کە پێیان ئەوترێ (مؤمنون) واتە ئیمانداران.

بەشی دووەم: ئەوانەن کە بڕوایان هەیە بەخوای پەروەردگار، بەڵام بڕوایەکی وا نیە کە پاڵیان پێوە بنێ بۆ کردەوەی باش، وە بۆ ئەوەی کە شوێنی یاسا و فەرمانی ئەو بکەون، ئەمانە هەرچەندە بڕواکەیان نەگەشتوەتە پلەی (تەواوی)، بەڵام هەرچۆنێ بێ ئەمانە لە یاسای ئیسلامدا بە کافر دانانرێن، و تۆڵەیان لێ ئەسێنرێ بەپێی تاوانیان هەروەکو تاوانبار، نەك وەکو یەکێ بەتەواوی لە یاسا یاخی بووبێ چونکە ئەمانە دانیان ناوە بەخاوەنی یاساداو ئامادەییان دەربڕیوە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی.

بەشی سێیەم: ئەوانەن کە بڕوایان بە خوای پەروەردگار نییە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ کردەوە ئەکەن لە دیمەندا لە باش ئەچێ، وەکو کردەوەی خواناسی باش وایە، جا ئەمانە لە راستیدا لە یاسای خوا دەرچوونو یاخیبوون. وە ئەو کردەوانەیان کە لە دیمەندا بەباش دائەنرێ . چونکە پەیڕەوی فەرمانی خوای پەروەردگاری تێدا نیەو بەپێی یاساو دەستوری ئەو نییە . هیچ نرخو بەهای نییە، وەکو ئەوە وایە پیاوێك بڕواناکات بە سەرۆکی دەوڵەتو دانی پێدانانێو شوێنی یاسای ئەو ناکەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ کردەوەی لێ ئەوەشێتەوە کە پێچەوانەی یاسای ئەو نییە، ئایا بەم پیاوە ئەوترێ کە دڵسۆزی سەرۆكو دەوڵەتەو بە گوێی فەرمانی ئەوی کردووە؟! یان

ئەوتریٚ پیاویٚکی یاخی‌یەو لە یاسای ئەو چووەتە دەرەوە.

بەشی چوارەم: ئەوانەن کە بڕوایان بە خوای پەروەردگار نی‌یە و کردەوەی واش ئەکەن کە پیٚچەوانەی دەستوری خوایە، ئەمانە خراپترین مرۆڤن لە جیهاندا چونکە هەروەکو لە یاسای خوا چوونەتە دەرەوە، هەروەهایش خراپەو کاری ناپەسەندو ئاژاوەو ناڕەوایی لە زەویدا بلاٚوئەکەنەوە.

لەم بەشکردنەوەی پیٚشەوە بۆمان روون دەبیٚتەوە کە بەختیاری‌و سەرکەوتنی مرۆڤ و دەرچوونی لە تاقیکردنەوەدا بە بڕواکردنی بە خوای پەروەردگارەوەیە، وەهەرگیز ئیسلامەتی لە دایك نابیٚ تەنها لە تۆوی بڕواوە نەبیٚ، بە شیٚوەیەك لەهەرکویٚدا ئیمان‌و بڕوا نەبیٚ کوفرو خوانەناسین هەیە، چونکە (کفر)و (ئیمان) لە جیٚگایەکدا کۆنابنەوە.

## بە چ هۆیەك ئەتوانین بگەینە زانین و بڕوای تەواو؟

لە پیٚشەوە تیٚگەیشتین کە فەرمانبەری خوای گەورە بەبیٚ بڕوا نابیٚ، لیٚرەدا ئەتوانی بپرسی: بەچ هۆیە ئەتوانین بگەینە زانینی راست‌و بەتەواوی تیٚبگەین لە یاسای خواو ئاوەلٚناوەکانی‌و دلٚنیاببین بە رۆژی دوایی؟

لە پیٚشەوە وتمان کە ئەم جیهانە بەم ریٚك‌وپیٚکیە و جوانی ئەم سروشتە لە هەموو روویەکەوە هەریەکە بە زمانی حالٚ بانگ ئەکات‌و شایەتی ئەدات، بە شیٚوەیە بۆمان روون ئەبیٚتەوە کە هەر ئەو خوایە ئەم بوونەوەرەی بەدەستەو بەم ریٚك‌و پیٚکیە ئەیبات بەریٚوە لە باشترین شیٚوەی (حیکمەت‌و زانین‌و دروستکردن‌و بەزەیی خوایەتی‌و دەسەلاٚت‌و هتد).

بەلاٚم مرۆڤ هەمیشە جیٚگای هەلٚە(خطأ)یە، ئەم هەموو نیشانە و بەلٚگانە لە بەردەمیایەتی لەگەلٚ ئەوەشدا هەندی بڕوایان وایە کە دوو پەرستراو هەیە، هەندیٚکی‌تر بڕوایان وایە کە سیانە، هی‌واش هەیە کە پەرستراوی زۆری بۆخۆی بڕیار داوە، هەندیٚکیش پەرستراویان دابەشکراوە بەچەند بەشیٚکەوە، گوایە

باران خوایەکی تایبەتی هەیەو ئاگر خوایەکی تری هەیە، هەروەها هەموو هێزێ لەم بوونەوەرەدا خوایەکی سەربەخۆو جیاوازی هەیە وە سەرۆکی هەموو خوایەکان خوایەکی گەورەیە کە هەموویان لە ژێر فەرمانی ئەودانو شوێنی ئەو ئەکەون، بەم جۆرە ژیریی ئادەمیزاد لە ناسینی خوادا بەهەڵەدا چووەو ئەچێ، لێرەدا ماوەی ئەوەمان نییە کە چۆنیەتی ئەو هەڵانە رون بکەینەوە.

هەروەها لە ژیانی دواییدا هەندێ بیروڕای هەڵەو شتی گۆترەیان بڕیار داوە، هەندێ ئەڵێن: هەر ئەم ژیانەیەو ئێمە تازە زیندوو ناکرێینەوە، هەندێکیتر ئەڵێن ژیانی مرۆڤ هەمیشە دووپات ئەبێتەوە لەم جیهانەدا و تۆڵەو پاداشتی خۆی هەرلێرەدا وەرئەگرێ، هەروەها یاسایەکە وا پێویست بێ مرۆڤ لەسەری بڕوا بۆ بەسەربردنی ژیانی خۆییو بەگوێرەی پێخۆش بوونی خوای پەروەردگار بێ، لەکوێ مرۆڤ خۆی ئەتوانێ بیدۆزێتەوەو دایبنێ لە کاتێکا هێشتا خوای پەروەردگارو ئاوەڵناوەکانی بەڕاستی خۆی لە خۆیەوە ناناسێ، ئەگەر مرۆڤ تێگەیشتنو زانیاریشی بگاتە پلەی ئەوپەڕ هێشتا ناتوانێ ئەم جۆرە شتانە تەنها بە بیری خۆی بناسێو بیاندۆزێتەوە، مەگەر دوای تاقیکردنەوەیەکی چەند ساڵیو بیرکردنەوەیەکی دوورو درێژ، وە بەپێی یاسای تاقیکردنەوەکە کە لەم ژیانەدا بڕیارمان داوە ئەبێ مرۆڤ بەرەڵا بکرێ بۆ ئەوەی بە هۆی بیرکردنەوەو هەوڵدانی خۆی راستیو بەختیاری بدۆزێتەوە، جا ئەو کاتە ئەو کەسەی کە هەوڵدانو لێهاتوویی خۆی یارمەتیداو گەیشتە راستی ئەوە دیارە لە تاقیکردنەوەکەدا دەرچووەو دەرگای سەرکەوتنو پێشکەوتنی لێ ئەکرێتەوە، ئەو کەسەیش کە هەوڵی تەواوی نەداو نەیتوانی بگاتە راستی. ئەوە لە تاقیکردنەوەکەدا دەرنەچووەو دەرگای سەرکەوتنو بەختیاری لەسەر دائەخرێ.

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم تاقیکردنەوەیە بەم شێوەیە تاقیکردنەوەیەکی گرانە،

خوای پـەروەردگار نایـەوێ بـەم گرانیـە مرۆڤـەکان تاقیبکاتـەوە، لەبـەر ئـەوە پێغەمبـەرانی ناردووە کە ئەوانیش هەر لە خۆیـانن، ئـەخۆن و ئەخۆنـەوەو لـە زمانیـان تێئەگەن، بەم شێوەیە ڕێگـای تاقیکردنـەوە گرانیـەکی تێـدا نامێنـێ، هەرکەس بڕوای بە چاکـە کـرد و بـە هـەوڵ و تێکۆشـان و بیرکردنـەوەی خـۆی گەیشتە ڕاستی و باوەڕی تـەواو، ئـەوە لـە تاقیکردنەوەکەدا دەرچووەو ئەگاتە بـەختیاری و کامـەرانی، هەرکەسـیش بـڕوای بەچاکـە نـەکردو وای زانـی هیـچ پێویستی نییە بەو کەسەی کەئەم چاکەیەی هێناوە، ئەوە هێزی بیرکردنـەوەو زانیاری لە خۆیا مراندووە و ئیتر ناتوانێ خوای پەروەردگارو ناوەڵناوەکانی بناسێ و بەڕوونی لەیاسای ئەو و ڕۆژی دوایی تێبگات و بڕوایان پێبکات.

## بڕواکردن بە نهێنی و شاراوەکان (الغیب)

بێگومان ئەگەر تۆ شتێك نەناسی پرسیار لە یەکێ ئەکەی کەشارەزا بێت و ئـەو شتە بـە جوانـی بناسـێ، ئینجـا ئیـتر بـڕوای پێئەکـەیت و دێیتـە سـەر بڕیارەکەی، بۆ نمونە: کاتێك نەخۆش بکەویت خۆت چارەسەری خۆت ناکەیت، بەڵکو ئـەچیت بـۆلای پزیشـك، جا ئەگـەر ئـەو پزیشـکە پزیشـکێکی تـەواو بـوو، شارەزاو خاوەن بڕوانامە(شەهادە)ی بـەرز بـوو، وە ئـەتزانی کـە گەلـێ کەسـیش بەهۆی ئەوەوە لە نەخۆشی ڕزگاریان بووە، ئینجا بڕوا ئەکەی کە ئەم پزیشکە ئەوەندە لێهاتووە کە بتوانێ ببێ بە هۆی ڕزگار بوونت لەو نەخۆشیە، وە لەبـەر ئـەوەی کە بڕوات هەیـە بـەم پزیشکە هـەر دەرمانێکت بۆ بـاس بکـات بـەکاری دەهێنی، و هەر پارێزێکت بۆ دابنێ خۆتی لێ ئەپارێزی، هەروەها بڕوات هەیە بە(پارێزەر) لە ئیشوکاری یاسادا بە گوێی بکەی، و بڕوات بە مامۆستا هەیە لە هەموو کاروبـارێکی پـەروەردەیی و فێرکردندا بڕوای پـێ ئەکـەی و گوێڕایـەڵی ئەبی، وە ئەگەر بتەوێ بچی بۆ جێگایەك کە ڕێگاکەی شارەزا نەبیت و نەیزانیت بڕوا بەکەسێ ئەکەی کە شارەزا بێ و ڕێگاکـەی بزانـێ، و هـەر ناونیشـانێکت بۆ

بکا بە گوێی ئەکەیت و بەقسەی ئەو ئەڕۆی بەڕێدا، بەم پێیەو بەم شێوەیە لە هەموو ئیش وکارێکی ئەم جیهانەدا مرۆڤ هەمیشە گوێڕایەڵی زاناو شارەزاکانەو بە قسەیان ئەکات.

ئا ئەمەیە بڕواکردن بە شارراوەکان (الغیب)، کەواتە بۆئەوەی بڕوا بەشارراوەکان بکەی پێویستە گوێڕایەڵی یەکێ بکەیت کە شارەزا بێ، دوای ئەوە بڕوا بە قسەو بڕیارەکانی بکەیت. بۆنمونە: تۆ خوای پەروەردگارو ناوەڵناوەکانی ناناسی، و نازانی کە فریشتەکان بەفەرمانی ئەو ئیش وکاری ئەم بوونەوەرە ئەبەن بەڕێوەو لە هەموو لایەکەوە هەن و چواردەوری مەردمیان داوە، وە نازانی ڕێگای راست کامەیە بۆ بەسەربردنی ژیانی خۆت بە گوێرەی پێخۆشبوونی خوای پەروەردگار، وە هەرگیز ئاگادار نیت لە رۆژی دوایی و ئەو شتانەی کە تیایدا ئامادەکراوە بۆ بەندەکان و نایزانی، بۆیە پێویستە کە ئەم جۆرە شتانە لە یەکێ وەرگری کە بڕوات بە قسەی هەبێ، دڵنیابیت لە راستگۆیی و خواناسی و پاک و خاوێنی، و تاقیت کردبێتەوە لە گوفتارو رەفتاریدا. بە شێوەیە کە بۆت دەرکەوتبێ کە هەرگیز درۆ ناکات و هەرچی بڵێ وەك شەبەقی بەیان راستە، ئا ئەمەیە مانای بڕواکردن بە شارراوەکان، وە ئەگەر بتەوێ فەرمانی خوا بەجێبێنی و بە شێوەیە کردەوە ئەنجام بدەی کە خوا پێی خۆش بێ. پێویستە بە هۆی پێغەمبەرەوەﷺ ئەم شتانە بزانی و تێبگەی. و بەبێ ئەم تێگەیشتن و شارەزاییە ناتوانیت بە ڕێگا راستەکەی ئیسلامدا بڕۆی.

## بەشی سێیەم

# پێغەمبەرایەتی

* بنج و بناوانی پێغەمبەرایەتی.
* ناسینی پێغەمبەر.
* بەگوێکردنی پێغەمبەر.
* پێویستیمان بەبڕواکردن بە پێغەمبەران.
* کورتەیەک لە مێژووی پێغەمبەرایەتی.
* پێغەمبەرێتی محمد(ﷺ).
* راستی پێغەمبەرایەتی محمد(ﷺ).
* دوایی هاتنی پێغەمبەرایەتی.
* چەند بەڵگەیەک لەسەر دوایی هاتنی پێغەمبەرایەتی.

*بێگومان له بەشی رابردوودا سێ شت تێگەیشتیت:*

*یەکـــەم: زانیـــت کـــه مـــرۆڤ پێویســـته بەراســـتی خـــوای پـــەروەردگارو ئاوەڵناوەکانی بناسێ و پاداشـــتو تۆڵـەی رۆژی دوایـی لەسـەر بـەگوێکردنو بەگوێ نـەکردنی فەرمانـەکانی تێبگاو بیزانـێ، وه ئـەبێ ئـەم زانینـەش بگاتـه پلەیەکی هەرەبەرز که گومانی تێدا نەمێنێ.*

*دووەم: ئەوەمان زانی که خوای پەروەردگار زۆری لەبەندەکانی نەکردووه که تەنها به هەوڵو کۆششی خۆیان بگەنه ئەم زانینـه، بەڵکو پێغەمبـەرانی هـەر لـه وێنەی خۆیان بۆ ناردوونو ئەم زانینەی پێبەخشیون، و فەرمانی پێداوون که ئەبێ فەرمانی خوا بگەیەنن بەبەندەکانی لەسەر ئەم کورەی زەویەدا.*

*سێیەم: زانیمان که خەڵکی هەر ئەوەیان لەسەره که نێرراوەکانی بناسن، و هەر که زانیان ئەو پیاوه نێرراوی خوایه ئەبێ بڕوای پێبکەنو گوێڕایەڵی بن، لەهەموو گوفتارو رەفتارێکدا بەبێ چەنو چوون.*

*وا ئێستا ئەمانەوێ باسی ئەوه بکـەین کـه بنـجو بنـاوانی پێغەمبەرایـەتی کامەیه؟ و چۆن ئەتوانین پێغەمبەران بناسین؟.*

## بنج و بناوانی پێغەمبەرایەتی

**خوای پەروەردگار لەم بوونەوەردا هەرچی مرۆڤ پێویستی پێی هـەبێ بۆی فەراهەم هێناوه، بۆ نمونه: هەرکه لەدایك ئـەبێ دوو چاوی داوەتـێ بـۆ بینـینو دوو گـوێ بـۆ بیستنو لـوت بـۆ هەناسـەدانو بۆنکردن، هـێزی هەسـتو دەسـت لێدانی لـەناو پێستدا داناوه بۆ راچەنینو هەسـتکردن، دوو پێـی داوەتـێ بـۆ رۆشتنو دوو دەست بۆ کـارکردنو مێشکی داوەتـێ بـۆ بیرکردنـەوه، هـەروەها ئەندامەکانیتر که له لەشی ئادەمیزاددا دایناوه هەریـەکێ بۆکارێكو هەرشتێ بۆ پێویستیەك، دوای ئەوه که مرۆڤ دێته ئەم جیهانـەوه هـەموو هۆیـەکی ژیـان لەبەردەمی خۆیدا ئـەبینێو دێته پێش چاوی، ئەوەتا شیر لەهـەردوو مـەمکی**

دایکـدا ئامـادەکراوە . کـە پاکـترینو باشـترین خۆراکـە . هـەروەها سـۆزو خۆشەویسـتی بـاوكو خزموکەسـوکار، دوای ئـەوە کـە کـەمێ گـەورە ئـەبێو پێویستەکانی ژیانی زیاتر ئەبێ هەموو شتێکی دەست ئەکەوێو بۆی دانامێنێ وەك (ئاو، هـەوا، رووناکی  هتد). وەك بڵێی هـەرچی هێز هەیە لـەم زەویو ئاسمانەدا تەنها بۆ مرۆڤەو لە پێناوی ئەودا هـەڵ ئەسوڕێو ئامادەیە، وە هـەر بۆ بەخێوکردنو پێگەیاندنی ئەو دانراوە و دروستکراوە.

دوای ئـەوە، چـەند هـەنگاوێکی‌تر بـۆ پێشـەوە ئـەنێ ئـەبینێ کـە خـوای پەروەردگار هەرچی پێویست بێ بەمرۆڤی بەخشیوە، وەکو: زیرەکیو ژیریی و لێهاتوویی و هێزی کارکردن، و هەموو کەسێ لەم هێزانە بەشی خۆی کەم یان زۆر دراوەتـێ وەك تێگەیەشـتن و قسـەکردنو بـیروهۆش، وە خوایـش لـەم جیهانەدا هەندێ ئیش‌وکاری هەیە کەهەر خۆی لەسەری سوپاس ئەکرێ، لەبەر ئەوە لەم بەشکردنەدا هەموو کەسی وەك یەك بەش نەداوە، ئەگەر بەشی هـەموو کەسی وەك یـەك بدایە ئیتر هیـچ کەسـێ پێوستی بـە کەسـی تـر نەئـەبوو تـا تێکـەڵیو هەسـتی کۆمەڵایـەتیان لـەناوا بڵاوبێتـەوە، لەبـەر ئـەوە هـەموو پێویسـتەکانی بـەجۆرێ بەخشـیوە کـە هـەموو کەسـی وەك یـەك لێنـەکردووە، ئەبینی بەشی یەکێکی لە شتێکا زۆ داوە، بەڵام بەشی یـەکێکی‌تری کەم داوە، هەندێ لە هێزی لەشدا بەشی داوە، یەکێ‌تر لە هونەردا بەشی داوە، وە یەکێ‌تر لە زیرەکیو ژیریدا و یەکێ‌تر لـە تێگەیشتنو بیروڕادا بەشی داوە، لەبەر ئەوە هەر لەسەرەتاوە مرۆڤی وا هەیە حەز لە سەربازی ئەکا و هی واش هەیە حەز لە سەرۆکایەتیو فەرمانڕەوایی دەکات، یەکێ ئەبینی هێزی وتاری ئاسایی نییە، بەڵکو لەهـەموو کـەس زیـاتر توانـای وتارخوێندنـەوەی هەیـە، یـەکێ‌تر هەیـە توانای دانانی تێدایە، یەکێ بیروڕای تیژە مێشکی فراوانە ئەتوانێ بەئاسـانی پرسیارە گرانو ئاڵۆزەکانی ڕێبازی ژیان شی بکاتـەوە زیـاتر لەیەکێکی‌تر، هـی واش هەیە لـە داهێنـانو دۆزینـەوەدا دەسـتی بـاڵای هەیـە. هـی‌واش هەیـە لـە

یاسادا مێشکی فراوانە، ئەتوانێ جوان شارەزای سوودو کەڵکەکانی ببێ بەشێوەیە کە یەکێکیتر بە ماوەیەکی زۆر ئینجا بتوانێ ئەوەی ئەو شارەزابێ.

ئەم بەشکردنەش هەموو لە خواوەیە کە ئەتوانێ لەبەخششی خۆی بەشی بەندەکانی بدا بۆ هەرکەس کە بیەوێ، وە هیچ کەس ناتوانێ ئەم بەهرەو بەشانە لە خۆیدا پەیدا بکات، وەنایشتوانێ بە فێربوون بیانگاتێ و فێریان ببێ، چونکە ئەمانە جۆرە بەخششێکی خوای پەروەردگارن کە ئەیاندا بەهەرکەسێ خۆی ئارەزووی ببێ لەناو بەندەکانیداو شایانیان بێ.

کاتێ لەم جیاوازی بەهرەو لێهاتنی مەردمە تێگەیشتی، ئینجا بزانە کە خوای گەورە لەبەر ژیریی، واتە لەبەر حیکمەتێکی گەورە کە بەپێی پێویستی جۆری ئادەمیزاد تواناو لێهاتوویی داناوە، هەندێ بۆ سەربازی دەست دەدا، هەندێ بۆ بازرگانی و کشتوکاڵ، هەندێ بۆ چنین و کارکردن دەست ئەدا، بەڵام ئەوانەی کە هێزی زانیاری و پێشەوایەتیان تێدابێ ژمارەیان زۆر کەمە، وە لەمانیش کەمتر ئەوانەن کە دەستی باڵایان هەبێ لەم رووەوە، یا ئێمە زیاتر پێویستیمان بەوانە هەیە کە لە زانیاری ئەندازەو بیرکاری و کیمیا و رژێم و ئابوریدا زۆر شارەزان و دەستی باڵایان هەیە، یان زیاتر پێویستیمان بەیەکێ هەیە کە بتوانێ بمانخاتە سەر رێگای راست؟! بێگومان پێویستیمان بە دووەمیان زیاتر هەیە، و شتێکی دوورە . بۆ خوای پەروەردگار. کەئەم هەموو پێویستیانەی مرۆڤی جێبەجێکردبێ کەچی بێئاگاو بێدەنگ بێ لە پێویستی هەرەگەورەی مرۆڤ. بەڵێ خوای گەورە لەناو مەردمدا هەندێ مرۆڤی دروست کردووە کە لەخۆیانەوە ئامادەن بۆ ئەوەی خوای گەورە بەچاکی بناسن وە فێری زانیاری ئاین و رەوشت و یاسای خۆی کردوون و فەرمانی پێداوون کە بەجوانی بیگەیەنن بەمەردمەکانی تر، ئەم مرۆڤانەن کە بە (نێرراوانی خوایان ئەناسین) درودی خوایان لەسەر بێ.

## ناسینی پێغەمبەر

هەروەکو ئەوانەی کە دەستی باڵایان هەیە لە زانیاری و هونەرمەندیو شتیوادا هەر لەسەرەتای تەمەنیانەوە هەندێ جیاوازی سروشتییان هەیە، هەرواش نێرراوەکانی خوا لەسەرەتاوە ئەوانیش هەندی نیشانەیان تێدا دەرئەکەوێ کە جیایان ئەکاتەوە لە مەردمی تر، بۆنمونە: ئەوەی کە بویژ بێ هەرکە گوێت لە هۆنراوەکانی بوو ئەزانی ئەمە بەهرەیەکی جیاوازە کە خوای گەورە پێی بەخشیوە، هەروەها نووسەرێکی گەورە وە یا خاوەن بیرێکی بیرتیژ وە یا پێشەوایەکی زیرەكو بلیمەت تەنها کردەوەکانیان شایەتی ئەدەن کە هەر یەکە لەمانە خوای گەورە هێزو توانایەکی وای داونەتێ کە بەهۆیەوە لە زۆر کەسانیتر جیائەناسرێن، هەروەها هەندێ بیروباوەڕو رەوشتی گەورەو بەنرخ ئەخرێتە مێشكو دڵو دەماغی پێغەمبەرەوە کە هیچ کەسیتر لێی ئاگادار نیەو پێی نەبەخشراوە، ئەو پێغەمبەرە جۆرە ئامۆژگاریو رانماییەك باس ئەکاو ئەیگەیەنێ بەمەردم کەکەسیتر وەکو ئەو ناتوانێو لێی نایە ئەوە بکات. وەهەندێ وردەکاریو شتی وا هەیە کە پێغەمبەر پێی ئەزانێ کەسانێ تر بەچەند کۆشش لە دوای چەند ساڵ نایدۆزنەوەو رێیان لێی ناکەوێت، هەر قسەیە ئەکا جێگای بڕوایەو دڵ وەریئەگرێ، هەرکەسێ ویستی لاسایی ئەو بکاتەوەو وەکو ئەو بلێ ناتوانێو بۆی ناکرێت، پێغەمبەر سروشتی خاوێنەو دەرونی هوشیارو پاكو بێگەردەو لە ئیشو کاریا رێگای پاکیو راستگۆییو بەرزی ئەگرێت، قسەیە ناکات کە لەگەڵ راستیدا نەگونجێ، مەردم شارەزای ژیریيو مەردایەتی ئەکا، خۆی بەر لەهەموو کەس ئەو ئەركو فەرمانانە جێبەجێ ئەکا کە بەمەردمی رائەگەیەنێ، رێك ناکەوێ ئیشێ بکا پێچەوانەی کردەوەیەك یان وتارێکیتری بێ لە ژیانیدا. خۆی ئازار ئەچێژێ لە پێناوی بەرژەوەندی مەردمدا، هیچ کەس وا ئازار ناچێژێ لە پێناوی بەرژەوەندی تایبەتی ئەودا.

بە كورتی ژیانی پێغەمبەر هەمووی راستی و دەستپاكی و مەردیی و بەرزیی و دەروون پاكیە، و پڕیەتی لە بیروڕای بەرزو مەردایەتی و ئازادی و راستی، بە هیچ شێوەیەك جێگای ناتەواوی و شتی شورەیی نی یە، ئەمانە بەزمانی حاڵ شایەتی تەواو ئەدەن كە ئەم پیاوە نێرراوی خوای گەورەیە، ناردویەتی بۆ ئەوەی رابەری مەردم بكات بۆ چاكەو لایان بدا لە رێگای خراپەو بەگوێكردنی شتی پڕوپوچ.

## بەگوێكردنی پێغەمبەر

هەركاتێ بۆت دەركەوت كە ئەو پیاوە پێغەمبەرەو لەلایەن خواوە نێرراوە پێویستە بە گوێی بكەی لەهەر فرمانێكا كە ئەڵێ بیكە، و واز بێنێ لەوەی كە بەرگری لێ ئەكات و ئەڵێ مەیكە، چونكە هیچ مانایە نی یە لەوەدا كە دانت ناوەو بڕوات كردووە كە ئەو پیاوە نێرراوی خوایەو هەرچی ئەڵێ لە خوای وەرگرتووە، كەچی بەگوێی فەرمانەكانیشی نەكەی، بەپێی ئەم دان پیانانەت ئەبێ لەهەموو فەرمانێكا بەگوێی بكەی بێ رەخنەو راوەستان، ئیتر یەكسانە لە سوودو كەڵكی فەرمانەكانی تێبگەی یان تێنەگەی، چونكە لەلایەن خواوە هاتووە وە فەرمانەكانی دیارە پڕە لە سوودو كەڵكی گشتی با تۆش پێی نەزانی. چونكە ئەم پێنەزانینەی تۆ شورەیی و ناتەواوییەك نی یە كەلەفەرمانەكانی ئەودا بێ. بۆنمونە: پیاوێك هەیە لە هونەردا زۆر بەكارو تەواوە. بەڵام لەوانە نی یە كە تۆ نهێنی و شاراوەكانی ئیشەكەی بزانی. شتێكی روون وئاشكرایە كە دوورە لە ژیریەوە ئەگەر فەرمانێكی دا بەسەرتا فەرمانەكەی بشكێنی بە بیانووی ئەوەوە كە تۆ لە نهێنی و سوودی ئەم فەرمانە تێنەگەشتووی، چونكە هەموو ئیشێ لە جیهاندا پێویستی بە پیاوێ هەیە كە بەجوانی بیزانێ و لە نهێنی و سوودەكانی شارەزابێ، وە هەر كاتێ مەردم ئەم پیاوەیان دەست كەوت ئیتر ئەچنە لایی و بڕوای پێ ئەكەن و لە كارە فەرمانەكانیدا رەخنەی لێ ناگرن، چونكە رێ ناكەوی كە هەموو مەردم لە

هەموو ئیشێکا دەستی بالأیان ببێ و هەموویان زۆر چاك لەو ئیشە بزانن، لێرەدا تەنها ئەوە پێویستە کەئەبێ هەرچی زیرەکی هێزو ژیریت هەیە بەکاری بهێنیو تەرخانی بکەی بۆ ناسینی ئەو پیاوە زاناو تێگەیشتوو شارەزایە، و دوای ئەوە کە ناسیت ئەبێ بڕوای پێبکەی و رەخنەی لێ نەگری، هەرگیز ئەوە ژیریی نییە کە پێی بڵێی: (بڕوات پێناکەمو باوەڕم بە زانیاریو شارەزاییت نییە هەتا منیش وەکو خۆت شارەزا نەکەیت و لە نهێنیو سود و کەڵکی فەرمانەکان تێم نەگەیەنی)، ئایا تۆ ئیشی خۆت نادەیتە دەست (پارێزەر) هەرکاتێ ئیشی دادگات هەبوو؟! پێم بڵێ: ئایا پارێزەرەکەت ناتکاتە دەرەوە ئەگەر لە کاتی دادگادا دەست بخەیتە ئیشو کاریەوە؟! وە پێم بڵێ: پزیشك واز لە چارەکردنت ناهێنێ ئەگەر رەخنە بگری لە راستیو باشی ئەو دەرمانانەی کە بۆت ئەنوێنێ؟!

هەر بەم شێوەیە سەیری ئاین بکە، ئەی برای بەڕێز! تۆ پێویستیت بە زانیاری خوای گەورە هەیە، و ئەبێ ئەو رێگایە بزانیت کە راستو شایان بێ بۆ بەسەر بردنی ژیانی خۆتو بە گوێرەی پێخۆشبونی خوای گەورەش بێ، بەلأم بە هیچ شێوەیە رێگا نییە بۆ دۆزینەوەی ئەم زانیاریەو ناسینی ئەم رێگایە خۆت لە خۆتەوە. کەواتە ئەبێ بگەڕێی بەدوای پێغەمبەرێکی راستو راستگۆدا. وەهەرچی توانات هەیە بیخەیتە کار بۆ دۆزینەوەی، چونکە ئەگەر پیاوێکت کرد بە پێشەواو پێغەمبەری خۆت کە نێرراوی خوا نەبوو ئەوە بێگومان لە رێگای راست ونت ئەکاتو ئەتخاتە سەر رێگایەکی چەوتو نالەبار، بەلأم دوای گەڕانو بیرکردنەوەی تێگەیشتن بۆت دەرکەوت کە ئەو پیاوە نێرراوی خوایەو لەلایەن خواوە رەوانە کراوە، ئەبێ هەموو بڕوای خۆت بخەیتە سەری و لە فەرمانکانی لانەدەیت لەهەر شتێکدا کە ئەڵێ بیکە وەهەر شتێك کە ئەڵێ مەیکە[°].

---

[°] (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا) الحشر / ٧ وەرگێران

## پێویستیمان بە بڕواکردن بە پێغەمبەران

هەرکاتێ زانیت کە ڕێگای ئاینی ئیسلام ئەو ڕێگا ڕاستەیە کە پێغەمبەر ئەیگەیەنێ بە فەرمانی خوا، ئەو کاتە ئەزانی کە هەموو مەردم لەسەریانە بڕوا بکەن بە پێغەمبەر و شوێنی فەرمان و ئامۆژگاریەکانی بکەون، و ئەو کەسەی پێچەوانەی فەرمانی ئەجولێتەوەو ڕێگایەکی جیاواز بۆخۆی دیاری ئەکات و لەسەری ئەڕوا بێگومان لە ڕێگای ڕاست ترازاوەو ون بووە، وە مەردم لەم بەندەدا شتی سەیریان هەیە، هەندێکیان دان بە ڕاستی پێغەمبەردا ئەنێن بەڵام بڕوای پێ ناهێنن وەبە گوێی ناکەن، ئەمانە وەنەبێ هەر تەنها کافر بن و بەس، بەڵکو شێت و نەفامیشن، چونکە مانای نییە بۆ داننان بە ڕاستی یەکێك داو کەچی بەگوێی فەرمانەکانی نەکەی!! مەگەر ماناکەی ئەوەبێ کە چاکە بگۆڕێتەوە بە خراپە، شارەزایی بگۆڕێتەوە بە وێڵی و ون بوون، ئایا ئەمە شێتی و نەفامی نییە؟!

هەندێکی واش هەیە ئەڵێن: ئێمە پێویستیمان بە شوێنکەوتن و بەگوێکردنی پێغەمبەر نییە، چونکە ئەتوانین هەر بەژیریی و لێهاتوویی خۆمان ڕێگای ڕاست بدۆزینەوە، ئەمەش دووبارە هەڵەیەکی گەورەیەو لە ڕێ ونبوونێکی خراپە بێگومان بیرکاریت خوێندووەو زۆر چاك ئەزانیت ئەو هێڵە ڕاستەی کە لە نێوان دوو خاڵدایە هەر تەنها یەك هێڵەو دووان نییە، وە هەر هێڵێ وانەبێ یا هێڵی ڕاست نییە وە یا نزیکترین ڕووبەر لە نێوان دوو خاڵدا نییە، هەروەها ئەو هێڵە ڕاستەی کە لە نێوان خواو بەندەکانیدایە هەر تەنها هێڵێکەو زیاتر نییە، هەنگاوێکیتر بۆ پێشەوە بنێ، خۆ زانیت ئەو ڕێگایە کە مرۆڤ بگەیەنێ بەخوا تەنها یەك ڕێگایە، ئەوەیە کە پێغەمبەران مەردمی بۆ شارەزا ئەکەن، کەواتە هەرکەسێ لەم ڕێگەیە لابداو خۆی ماندوو بکا بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەکیتر، بێگومان ئیشی ئەو یەکێ ئەبێ لەم دوو وێنەیەی

خوارەوە:

یان هیچ ڕێگایەك نادۆزێتەوە کە بیگەیەنێ بە خوا، یان ڕێگایەکی دوورو درێژ و چەوتو نالەباری دەست ئەکەوێ، لە وێنەی یەکەمدا گومان نی یە لە تیاچوونو ونبوونیدا، لەوێنەی دووەمیشدا کەمتر لە نەفامیو شێتی بۆ نامێنێتەوە، سەیری وڵاخ ئەکەی کە نیازی شوێنێ بکا ڕێگایەکی ڕاستو کورتتر هەڵئەبژێریو پێیدا ئەڕوا، ئەی چی ئەڵێی لەگەل مرۆڤێکا خوای گەورە ژیریی پێبەخشیوەو پێغەمبەرانی ناردووە کە شارەزایی بکەن بۆ ڕێگای ڕاست، بەڵام ئەو ئەڵێ نەخێر من شوێنی تۆ ناکەوم، و ئەو ڕێگایە ناگرم کە تۆ نیشانم ئەدەی، بەڵکو خۆم هەوڵ ئەدەم بەڕوودا ئەکەوم لە ڕێگایەکی تاریكو نوتەکدا هەتا ئەگەمە ئامانجی خۆم!

ئەمەیش شتێکە بە بیرکردنەوەیەکی بچووك هەموو کەس تێ ئەگاو ئەیزانێ، بەڵکو ئەگەر بیری خۆت بەجوانی بخەیتە کارەوە ئەزانی ئەو کەسەی نایەوی بڕوا بهێنێ بە پێغەمبەر هەرگیز ڕێگایەکی دەست ناکەوێ کە بیگەیەنێ بە خوا، ڕاست بێ یان چەوتو لار، چونکە ئەوە شتێکی وا داگیری کردووە کە ناتوانێ دان بنێ بەڕاستیداو بە شێوەیە: یان ژیریی ناتەواوە یان مرۆڤێکە خۆی زل ئەگرێ و لەسروشتیدا چەوتیو لاریەکی ئەوتۆ هەیە کە نایەڵێ دان بەڕاستیدا بنێ. یان کوێرانە شوێن باووباپیرو هاوڕێو دەوروبەری خۆی کەوتووە، نایەوێ شتێ ببیسێ کە بە کەلەپوور لە باووباپیرەوە بۆی نەهاتبێتەوە، یان بەندەیەکی ئەوتۆیە کە ئارەزووی خۆی ئەپەرستێ و شوێنی کەوتووە، هەرگیز نایەوی بەلای ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەردا ئاوڕێك بداتەوە، چونکە ئەزانێ ئەگەر ئەم ئامۆژگاریانە وەرگرێ ئیتر ماوەی نییە بۆ تاوان کردنو ئەو تاوان و خراپانە کە خوی پێوەگرتووە لە ژیانیدا، وە هەر کەسێ هۆیە لەم هۆیانەی تێدابێ ڕێك ناکەوێ کە ڕێگایە بگرێتەبەرو حەزی لێ بکات، بەڵام هەرکەس لەم هۆیانەوە دووربێو پاكوخاوێن بێ هەرگیز ڕێك ناکەوێ کە سەرپێچی لە فەرمانەکانی

پێغەمبەردا بکات و بەگوێی ئامۆژگاریەکانی نەکات.

ئەوەی کەلێرەدا پێویستە لێی بێئاگا نەبین ئەوەیە کە پێغەمبەر نێرراوی خوایە، ئەو خوایە فەرمانی پێداوە کە ڕێگاو ئامۆژگاری خوا بە مەردم بگەیەنێ، کەواتە ئەو کەسەی کە بڕوا بە پێغەمبەر نەهێنێ وەکو ئەوە وایە کە لە فەرمانی خوا دەرچووە، بۆ نمونە: پێویستە گوێڕایەڵی فەرمانبەرێ بی کە (میری) دیاریکردووە و تۆش یەکێکی لەو گەلە، وە ئەگەر گوێڕایەڵی ئەو فەرمانبەرە نەبویت ئەوە لە فەرمانی میری دەرچویت و یاخی بویت، چونکە دان نانێت بەو میریەدا و بەگوێنەکردنی فەرمانبەری ئەو دوو شتن بەیەکەوە ناگونجێن و ڕێك ناکەون. ئەمە نمونەیە لە نێوانی خواو ئەو پێغەمبەرەدا کە ناردویەتی، خوا خۆی پاشاو گەورەی راستیە بۆ هەموو مەردم، کەواتە هەرکەسی نارد بۆ لایان کەشارەزایان بکات و ڕێگای راستیان نیشان بدات، پێویستە بەگوێی بکەن و لە فەرمانی دەرنەچن و نابێ بە هیچ ڕێگاو فەرمانێکیتر بیگۆڕنەوە، وەئەوەی کە لەگەڵیا نابێت و بە فەرمانی ناکات، ئەوە (کافر)ە ئیتر بڕوای بە خوا ببێ یا نەیبێ.

## کورتەیەك لە مێژووی پێغەمبەرایەتی

ئێستا ئەمانەوێ ئەوە روون بکەینەوە کە زنجیرەی پێغەمبەرایەتی چۆن دەستی پێکردووە و بەرز بووەتەوە هەتا گەیشتوەتە دوا هەڵقەی کە ناردنی پێغەمبەری ئیسلامە (محمد) بەهەزاران درودی خوای لەسەربێ، وەئیتر دوای ئەو پێویست بە ناردنی پێغەمبەرێکی تر ناکات.

شتێکی ئاشکرایە کە لەسەرتاوە خوای پەروەردگار یەك مرۆڤی دروستکردووە، ئەم هەموو نەوەیە کە ئێستا هەیە لەو تەنیا مرۆڤەوە پەیدا بووە و ئێستا بووە بەچەندەها گەل و نەتەوەی جیاجیا لەسەر روی ئەم زەویەدا، وە هەموو زاناکان وایان بۆ دەرکەوتووە کە مرۆڤی سەر زەوی لە چەند مرۆڤێکی

جیاوازەوە نەهاتووە، بەڵکو هەموویان لە بەرەبابێکن لە یەك رەگ و بنەڕەتەوە هاتوون، وە ئەم تاکە مرۆڤەیش باوکە گەورەمان (ئادەم) پێغەمبەرە ﷺ وە وشەی ئادەمیزاد کە هەموو جۆری مرۆڤ ئەگرێتەوە، لەوەوە هاتووەو جیا بوەتەوە، وە ئادەمیش یەکەم پێغەمبەرێ بووە کە خوای گەورە هەڵیبژاردووەو ناردویەتی بۆ ئەم سەرزەویە، وە فەرمانی داوەتێ کە (ئاینی ئیسلام) بگەیەنێ بە رۆڵەکانی خۆی لەو سەردەمەدا. واتە پێیان رابگەیەنێ کە ئەم بوونەوەرە تاقەپەرستراوێکی هەیە کە ئەبێ هەر ئەو بپەرستن و بەس، وە ژیانی خۆیان بە گوێرەی پێخۆشبوونی ئەو بەسەر بەرن، جا ئەگەر وایانکرد ئەوا پاداشتیان چاکەیە، بەڵام ئەگەر وایان نەکرد تۆڵەی خراپەیان لێ ئەسێنرێ، وە چاکەکان ئەوانەیان بوون کە بەگوێی ئادەمیان کرد و شوێنی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار کەوتن و رێگای راستیان گرتەبەر، بەڵام خراپەکانیان ئەوانەبوون کە شوێن هەوەس و ئارەزووی خۆیان کەوتن، تا وای لێهات لەناو نەتەوەی ئادەمدا خراپەکاری بڵاوبوەوەو پەرەی سەند، هەندێکیان دەستیان دایە خۆر پەرستن و هەندێ مانگ پەرستن، وەهەندێ تریش ئەستێرە، هەروەها تاقمێ دەستیان دایە دارو بەرد پەرستن، وە هەندێکیش رووبارو زیندەوەرو شتی وایان ئەپەرست، تاقمی وا هەبوو بڕوای وابوو کە ئاگر خوایەکی هەیەو ئاویش خوایەکی‌تر، نەخۆشی خوایەکی هەیە و لەش ساغی و تەندروستی خوایەکی‌تر، هەروەها هەموو هێزێ لەم بوونەوەرەدا خوایەکی سەربەخۆو جیاوازی هەیە، و مرۆڤیش ئەبێ ئەم هەموو خوایانە بپەرستێ و هەوڵ بدا بۆ ئەوەی هەموویانی لێ رازی بێ، هەتا هەموویان بەشی بدەن و لەسایەی هەموویان بێبەش نەبێ و لە سزاوو تووڕەییان پارێزراو بێ، ئابەم شێوەیە نەفامی لە دایك بوو، لە شێوەی بتپەرستی و هاوەڵ بڕیارداندا بۆ خوای پەروەردگار، و ژمارەیەکی ئاینی جۆربەجۆر لەسەر زەویدا پەیدا بوون و بەناو زۆر گەل و نەتەوەدا بڵاوبوونەوە، وەهەر نەتەوەو گەلێ ئاینێکی جیاوازی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو کە چەند

ـروشم و نیشانەیەکی تایبەتی هەبوو، بەپێی ئەو نیشانەو دروشمە تایبەتیانە
ـە ئاینەکانی‌تر جیا ئەبوەوە، بەکورتی مەردم لە کاتێکا خوای پەروەردگاریان
ـەبیرچووەوە ئینجا ئەو ئایینە راستەشیان لەبیرچوەوە کە باوکە گەورەمان
ئادەم) لە خواوە بۆی هێنابوون، و بەم شێوەیە شوێنی حەزو ئارەزوو بیر ورای
خۆیان ئەکەوتن، و چەندەها خورەشتی ناپەسەند لە نێوانیاندا جێگیر بووبوو،
بیروباوەڕی بۆگەن و نەفامی لە ناویاندا بڵاو بووبووەوە، وایان لێهاتبوو کە
چاکەو خراپەیان لێك جیا نەئەکردەوە.

لەبەر ئەوە خوای پەروەردگار دەستی‌کرد بە ناردنی پێغەمبەران بۆ لایان، بۆ
هەر گەل و نەتەوەیە پێغەمبەرێکی ئەنارد بۆئەوەی بانگیان بکات بۆ ئەو ئاینەی
کە لە پێشەوە ئادەم بانگی بۆ کردبوو، وەهەروەها بانگیان بکات بۆ پەرستنی
خوای تاك و تەنیا، و هەرچی خراپەو بتپەرستی و نەفامی هەیە لە رەگ و ریشە
دەری بێنن و زەوی پڕ بکەن لە چاکەو خواپەرستی و رێبازی ژیانیان بۆ روون
بکاتەوە بۆ ئەوەی ژیانی خۆیان لە فەرمان و پێخۆشبوونی خوای پەروەردگارا
بەسەر بەرن، ناوچەیە لە ناوچەکانی ئەم زەویە نی‌یە کە پێغەمبەری تێدا
نەنێررابێ؛ (هندستان، چین، فارس، میصر، عێراق، ئەفەریقا، ئەوروپا) هەموو
ناوچەکانی تری ئەم زەویە پێغەمبەران و نێرراوانی خوایان تێدا هەڵکەوتووە،
وەئەم پێغەمبەرو نێرراوانەیش یەك ئایینیان هەبووە، ئەویش ئەو ئایینە بووە
کە ئەمرۆ پێی ئەڵێن (ئایینی ئیسلام)، بەلام هەر پێغەمبەرێ شێوەی
گەیاندنەکەی جیاواز بووە لە شێوەی گەیاندنی پێغەمبەرێکی‌تر، ئەویش لەبەر
جیاوازی ئەو نەخۆشیە کۆمەلایەتی‌یە بووە کە نێرراوە بۆ چارەسەرکردنی.

لەبەر ئەوەی ئەم نەتەوەو گەلانە هێشتا هەر لە قۆناغی یەکەمدا بوون،
لەبارەی شارستانی و کۆمەلایەتیەوە ئەو پێغەمبەرەی کە هاتووە بۆلایان چەند
ئامۆژگاری و پەیامێکی سادەی بۆ هێناون، وە بەپێی پێشکەوتنیان لە رووی
شارستانی و کۆمەلایەتی و ئامۆژگاریەوە پرۆگرامیان بۆ زیادکراوە و پەرەی

پێدراوە، بەڵام هەرچی جیاوازیەکیان بووە تەنها لە دیمەنا بووە، چونکە ئەو گیانو خوێنەی کە لەناو هەموو ئاینو پرۆگرامەکاندا هاتوچۆی کردووە تەنها یەك شت بووە، ئەویش بریتی‌یە لە خوا بەیەك زانین لە باوەڕداو دڵسۆزیو راستی لە کردەوەداو باوەڕهێنان بە رۆژی دوایی.

بەڵام هەڵوێستی مەردم بەرامبەر بە نێرراوەکانو پێغەمبەرانی خوا زۆر سەیرەو جێگای سەرسوڕمانە، چونکە لەباتی ئەوەی یارمەتی تەواویان بدەن کەچی لێیان دوور ئەوەستانو دەستیان ئەکرد بە ئازاردانی خۆیانو یارەکانیان، هەندێکیان ئەکوشتن، وە هەندێکیشیان لە وڵاتی خۆیان دەرئەکردن، بە شێوەیەکی وا ژمارەیەکی کەم بڕوایان پێ‌هێناونو شوێنیان کەوتوون، لەبەر ئەوە لە دوای نەمانی خۆیان ژمارەیەکی زۆر کەم لەسەر بیروباوەڕی پێغەمبەرەکان ماونەتەوەو زانیویانە کە تەنها رێبازی ئەوان راستە، بەڵام ئەم بەندانەی کە خوا هەڵیبژاردوون ماندوو نەبوونو کۆڵیان نەداوە هەتا بانگەکەیان گەیاندووە بە زۆر شوێنی وڵاتانو گەورەترین گەلانو نەتەوەکانی رووی زەوی بڕوایان پێکردوونو لەسەری رۆیشتوون، ئا لێرەدا نەفامیو ونبوونەکە شێوەیەکی تری تازە وەرئەگرێ، چونکە مەردمەکە دەستیان دایە گۆڕینو تێکدانی بەرنامەی پێغەمبەران لە دوای خۆیان، و هەندێ شتی گۆترەو درۆو دەلەسەیان تێکەڵ ئەکرد، و بەهەوەسو ئارەزووی خۆیان رێگایەکی‌تریان بۆ خواپەرستی دائەناو پەسەندیان ئەکرد، هەندێك دەستیان ئەدایە پەرستنی پێغەمبەرەکانی خۆیان، و هەندێکیش ئەیان وت: خوا هاتوەتە سەر زەوی لە شێوەی فلان پێغەمبەردایە، و هەندێك پێغەمبەرەکەیان بە کوڕی خوا دائەنا، هەندێکی‌تریان پێغەمبەرەکەیان بەشدار ئەکرد لە پەرستندا، هەروەها مەردم بەم جۆرە پەیامی پێغەمبەرانیان ئەکرد بە گاڵتە بازاڕو شتی وایان تێدا دروست دەکرد کە بە هیچ شێوەیەك بە پەیامەکەوە نەئەلکا، و زۆر دوور بوو لە راستیو خواپەرستیەوە لە هەموو کاتو چەرخێکدا، وە لە زۆر ناوچەکاندا بتو

پەیکەریان دائەنا بۆ ئەوانەی کە بۆ شکاندنی بتو لەناوبردنی بتپەرستی نێررابوون، ئامۆژگاریو پرۆگرامی پێغەمبەرانیان ئەگۆڕیو پڕیان ئەکرد لە دەستکردو خورەوشتی نەفامیو چیرۆكو داستانی درۆو دروستکراو، هەتا دوای چەند سەدەیەك وای لێهات هۆیەکی ئەوتۆ نەئەمایەوە کە ئاینی پێشووی لێ جیابکرێتەوەو شێوە راستەکەی پێبناسرێتەوە، وە خورەوشتی پێغەمبەرەکانیش لەناو داستانی هەڵبەستراوو درۆو دەلەسەدا بزر ئەبوو، و وەبەئاسانی نەئەناسرا کە بەتەواوی جێگای باوەڕ بێ. بەڵام وەنەبێ هەوڵدانی ئەو پێغەمبەرانەش هەروا بێ هوودەو بێسوود بووبێ، چونکە هەرچۆن بێ وێنەیەك لە راستیو دەستپاکیو روونـاکی لە هەموو گەلێکدا ئەمایەوە، بۆنمونە بڕوا بەخوا و ژیانی دوایی لە هەموو گەلو نەتەوەیەکدا بەهەر شێوەیەك بووبێ ئەمایەوە، و هەموو جیهان هەمیشە دانیان ناوەو بڕوایان کردووە بە پاکیو راستیو رەوشت بەرزی، وەهەموو پێغەمبەرێ گەلەکەی خۆی بە جۆرێ پەروەردە کردووە لەوانەیە یەك ئاینی راست بتوانێ هەموو سەر زەوی بگرێتەوە بۆ ئەوەی هەموو ئادەمیزاد پەیڕەوی یەك ئاین بکەن بێ جیاوازی لە نێوان گەلو تیرەو نەتەوەیەکدا.

لەپێشەوە وتمان کە هەموو پێغەمبەرێ بۆ گەلێکی تایبەتی نێرراوەو بانگەکەی تەنها بۆ ئەوان بووەو بەس، ئەویش لەبەر ئەوە لەو کاتو چەرخەدا گەلانو نەتەوەکانی سەر زەوی پچڕپچڕبوونو پەیوەندی هاتوچۆیان بۆلای یەکتر زۆر ئاسان نەبووە، لەبەر ئەوە یەك پرۆگرامو بیروباوەڕ بەئاسانی نەیتوانیوە هەموویان بگرێتەوەو لە نێوانیاندا بڵاوببێتەوە، سەرەڕای ئەوەش هەموو گەلێ لەم گەلانە باری ژیانی جیاواز بووە لە گەلێکیتر، وە نەفامیو نەزانینیش هەموو ناوچەکانی سەر زەوی داگیرکردبوو، لەبەر ئەوە نەئەگونجا کە تەنیا پێغەمبەرێ بەتەنیا ئاینو بەرنامەیەکەوە رەوانە بکرێ بۆ هەموو گەلانی رووی زەوی، وەئەم تەنیا پێغەمبەرە ئەم هەموو نالەباریو خراپە

جۆربەجۆرانە وردەوردە لەناو ببا و لە جێگەی هەموویاندا بەرنامەو خورەوشتی جوان و بەکەڵك دابنێ، وەهەر وەکو دایك منداڵەکانی پەروەردە ئەکا ئەویش وەها ئەندامەکانی ئەم گەلانە هەموویان پێبگەیەنێ و پەروەردەیان بکات، وە ئیتر خوا ئەیزانێ ئەبێ چەند هەزار ساڵ رابوردبێ لە پێگەیاندن و پەروەردەکردنی گەلان و نەتەوەکاندا بە شێوەیە کەباسمانکرد هەتا مرۆڤایەتی سوری منالی و ساوایی تەواوکردو پێی نایە قۆناغی ژیریی و گەورەبوون.

وەپەیوەندی ناو گەلان وردە وردە دەستی کرد بە پەیدا بوون بە هۆی پێشکەوتنی بازرگانی و پیشەسازیەوە، وە مەردم لە ولاتانی ژاپۆن و چینەوە توانیان بچن بۆ ئەوروپاو ئەفەریقا بە ڕێگای ئاوی و وشکاییدا، وە نووسین و خوێندەواری لە زۆر وڵات پەرەی سەندو زانیاری و هونەرو پیشەسازی بڵاوبووەوە، وەدەست درایە ئاڵوگۆڕی بیروڕا و باسە زانیاریەکان، و لە هەموو لایەکەوە داگیرکەران و زۆرداران پەیدا بوون و وڵاتانیان داگیرکردو میرنشینی و فەرمانڕەواییان لە زۆر ناوچەکانی وڵاتاندا دامەزران، وە ڕێك ئەکەوت لەیەك وڵاتدا چەند نەتەوەو گەلێك جێگیر ئەبوون و پێکەوە ئەژیان لەژێر یەك یاساو رژێمدا، وە ئەو جیاوازی و دووریەی کەلەناو زۆربەی گەلاندا هەبوو وردە وردە دەستی کرد بە لاچوون و نەمان، تاوای لێهات بۆ ئەوە شیاوبێت کە ئایینی ئیسلام بە تاکە بەرنامەکەیەوە دابەزی بۆ هەموو گەلانی رووی زەوی.

ئەگەر ئاوڕێ بدەیتەوە بۆ دوو هەزار ساڵ لەمەوپێش لە مێژووی مرۆڤدا بۆت روون دەبێتەوە بە زمانی (حاڵ) هاوار ئەکاو داوای هاتنی ئاینێکی تێروتەواو ئەکات کە فریای هەموو مرۆڤایەتی بکەوێ لە هەموو جیهاندا. چونکە ئاینی (بوزی) ئاینێکی وا تێروتەواو نەبوو. تەنها بریتی بوو لە هەندێ دروشم و نیشانەی خورەوشت، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لە وڵاتانی ژاپۆن و چین و مەنگۆلیای گرتبووەوە، وەلە لایەکی تریشەوە وڵاتی ئەفغان و بوخارای گرتبووەوە. بەچەند سەدەیەك دوای ئەو ئاینی (مەسیح) هات، بێگومان مەسیح

پێغەمبەریش ئاینی ئیسلامی هێنابوو، بەڵام ئەوانەی کەلە دوای مەسیح هاتن ئاینەکەیان تێکەڵ بە زۆر شتی پڕوپوچ و دور لە راستیەوە کرد، لەبەر ئەوە ئەویش ناتەواو مایەوەو ناوئەبرا بە ئاینی (مەسیح)، لەگەڵ ئەوەشا لە زۆر وڵاتی فارس و ئەفەریقاو ئەوروپا بڵاوبوەوە، کە ئەمیش وای ئەگەیەنێ جیهان چاوەڕوانی ئاینێکی گشتی و جیهانی ئەکات، بە شێوەیە ئەگەر دەستی نەکەوێ لەوانەیە خۆی بەچەند ئاینێکی ناتەواو رازی بکات و لە ناویدا بڵاوببێتەوە.

## پێغەمبەرێتی محمدی کوڕی عبدالله (ﷺ)

ئا لەم کات و چەرخەدا کە باسمان کرد، وە جیهان چاوەڕوانی هاتنی تاقە نێرراوێك ئەکات، بە تاقە ئاینێکەوە بۆ هەموو گەلانی رووی زەوی. لەم کاتەدا پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ ئاسۆی کێشاو پەیدا بوو لە وڵاتێکا کە پێی ئەوترێ (وڵاتی عەرەب). وە خوای گەورە پێی سپارد کە بەرنامەو ئاینێکی گشتی و هەمیشەیی و هەتاهەتایی بگەیەنێ بە هەموو جیهان.

ئەگەر چاوێ بە جوغرافیای جیهاندا بخشێنی بۆت دەردەکەوێ کە ئەم ناوچەیە باشترین زەوی و لەبارترین شوێنە کە بشێ بۆ ئەوەی ئەم پەیامە جیهانیەی تێدا دابەزێ (اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ) الأنعام/ ١٢٤، چونکە ئەبینی ناوچەیەکە کەوتوەتە نێوان ئاسیاو ئەفریقاوە، و نزیکترین ناوچەشە لە ئەورووپاوە، بەتایبەتی لەو کات و چەرخەدا کە گەل و نەتەوەکانی ئەوروپا. ئەوانەی کە پێشکەوتوون و شارستانی یان تێدابوو. هەموویان لە بەشی خوارووی ئەورووپادا جێگیر بووبوون، وە دووری ئەم بەشەی ئەوروپا ئەوەندەی دووری هندستان ئەبێ لەم ناوچەیەوە، وە هەروەها ئەگەر بەوردی سەیری لاپەڕەکانی مێژوویش بکەی ئەبینی گەل و نەتەوەی عەرەب لەو کاتەدا شیاوتر بووە بۆ ئەوەی ئەم ئایینە گەورەیەی بۆ رەوانە بکرێ، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوە کە گەل و نەتەوەکانی تر بە هۆی شارستانی و پێشکەوتنیان لە رووی رابواردن و

شتی واوە نیشانەی سستی و بێهێزی سەری لێدابوون، چونکە جیهان هەمووی لەدەستی ئەواندا بوو.

بەڵام گەلی عەرەب . لەوکاتەدا . هێشتا هەر تینی مەردیو پیاوەتیو خوێن گەرمی تێدا مابوو، وەگەلەکانیتر بەهۆی ئەوەوە کە خوویان دابووە رابواردنو بێئاگایی لەبەر ئەوە بێهێزو سستو تەمەڵی لێی وەستابوونەوە، نەتەوەی عەرەب هەتا سەدەی شەشەمی زاینی هێشتا تەوژمی خراپەو خراپەکاری بەتەواوی نەی گرتبووەوە وەك لەناو نەتەوە شارستانیەکانیتردا، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ رەوشتی بەرزی مرۆڤایەتییان تێدا مابوو کە هێشتا رەشەبای شارستانێتی و رابواردن رامالی نەکردبوو، وەعەرەبەکان . لەوکاتەدا . ئازاو بەجەرگ بوون، ئاگای ترسو لەرزیان نەبوو، بیروڕایان ئازادو سەربەست بوو، ملیان بۆ هیچ کەس کەچ نەئەکرد، لە پێناوی ناموسدا گیانی خۆیان بەخت ئەکرد، و هێشتا بە ژیانی خێڵەکیو دەوارنشینو سادە ئەژیان، هەرچەند گومان نییە لەوەدا کە زۆر خورەوشتی خراپو ناپەسەندیان تێدا بوو، بەڵام لە راستیدا هۆی ئەوەبوو کە ماوەی دوو هەزارو پێنج سەد ساڵ بوو هیچ پێغەمبەرێکیان تێدا هەڵنەکەوتبوو، وە پێشەوایەکی وایش نەبوو کە ئامۆژگاریان بکاتو لە خورەوشتی ناپەسەند دووریان بخاتەوە و فێری تێگەیشتنو شارستانێتی راستەقینەیان بکات، بۆیە نەفامی لە ناویاندا پەرەی سەندبوو بەرادەیەك کەس نەیئەتوانی چارەیان بکاتو لە تاریکی ئاژەڵیو درندەیی رزگاریان بکاتو بیانخاتە ناو رووناکی مرۆڤایەتیو ئادەمیزادی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لەباربوون بۆ ئەوەی کە جیهانیان پێ راست بکرێتەوەو لە شوێنی خۆیا دابنرێ بەمەرجێ جوان پەروەردە بکرێن، وەهەرچی خورەوشتی خراپیان هەیە بسڕرێتەوەو لە جێگایدا خورەوشتی جوان دابنرێ، وە هەرچی ئەو خورەوشتە بەرزانەی کە هێشتا لەناویاندا ماوە پەرەی پێبدرێو بەجوانی ئاراستە بکرێ بۆ کردەوەی باشو سوودی گشتی، ئا بەم

شێوەیەو بەم وێنەیە ئەم ئایینە تازەیە پێویستی بە نەتەوەیەکی بەم وێنەیە هەبوو، دوای ئەوە کەمێکیش سەیری زمانی عەرەبی بکە، چونکە ئەگەر بە جوانی لەم زمانە بکۆڵیتەوەو وێژەو هۆنراوەکانی بە وردی بخوێنیتەوە، بۆت دەردەکەوێ کەوا باشترین زمانە بۆ دەربڕینی بیروباوەڕو بەرنامەی گشتیو جیهانی. وە بۆ دیاریکردنی مانای خواناسینو کارکردن لە گیانو دەرونیدا، ئەبینی بەچەند رستەیەکی کورتو بچووك گەورەترین ماناو مەبەست ئەگەیەنێ و بەجوانیش کارئەکات لە سۆزو دەروونذا.

وەمانای قورئانی پیرۆز پێوستی بە زمانێکی ئا بەم جۆرە هەیە، ئینجا لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە بۆچی خوای گەورەو پەروەردگار وڵاتی عەرەبی هەڵبژارد بۆ ئەوەی ئەم پەیامە گەورەو جیهانیەی بۆ رەوانە بکات.

با ئێستا لەوە بکۆڵینەوە و بزانین ئەو هۆیە چیە کە ئەم مرۆڤەی وا لێ کردووە کە خوا هەڵیبژاردووە بۆ ئەوەی ئەم پەیامە بێوێنەیەی پێدا بنێرێ؟!

## راستی پێغەمبەرایەتی محمد(ﷺ)

ئاوڕێ بدەرەوە بۆ هەزارو چوار سەد ساڵ لەمەوبەر، ئەبینی کە تەلەفۆنو فڕۆکەو ئۆتۆمبێلو شەمەندەفەرو ئەم جۆرە شتانە هیچیان لە کایەدا نەبوون. وە چاپخانەو رۆژنامەو گۆڤار نەهاتبوونە کایەوە، و پەڕاوەکان بەم شێوەیە بەئاسانی بە جیهاندا بڵاونەبوونەتەوە، وەمەردم بە ئاسانی نەیتوانیوە لە شوێنێکەوە بگوازێتەوە بۆ شوێنێکیتر وەکو لەم کاتو چەرخەی ئێمەدا، بێگومان وڵاتی عەرەبیش هەروا پچڕاو بووە لە وڵاتانیتر، هەرچەند وڵاتی رۆمو فارسو میسر بە دەوریدا بوون، بەڵام زنجیرە چیاکانی دەورو بەری بەتەواوی لەم وڵاتانەی پچڕی بوو، وەهەندێ لە بازرگانە عەرەبەکان بە سواری وشتر خۆیان ئەگەیاندە ئەم وڵاتانە، بەڵام مەبەست لەم رۆیشتنانە تەنها کڕینی هەندێ کەلو پەلو فرۆشتنی هەندێکیتر بوو، وە ئەم ناوچەی عەرەبە بە هیچ

شێوەیەك شارستانێتی پێشكەوتوو و قوتابخانەو نامەخانەی تێدا نەبووە، زانیاری و خوێندەواری لە ناویاندا بڵاونەبووبووەوە، ئەوانەی كە خوێندنەوەو نووسینیان ئەزانی بەپەنجەی دەست ئەژمێرران، میری و فەرمانڕەواییەكی وایان تێدا نەبوو كە وشەیان یەك بخات و دادپەروەری و ئاسایشیان تێدا بڵاو بكاتەوە، هەر تیرەیە خۆی بۆخۆی ئەژیاو سەربەست و ئازاد بوو، بەئارەزووی خۆیان تاڵان و بڕۆیان ئەكردو زەوی و زاریان لەمەردم داگیر ئەكرد، شەڕو شۆڕو ئاژاوەو خوێن ڕێژی لەناویاندا تەشەنەی كردبوو، گیانی مرۆڤ لەلایان هیچ نرخێكی نەبوو، بەسەر هەر كەسێكا دەسەڵاتیان ببوایە كوشتنی ڕەوا بوو. ئەوەی پێی بڵێی ڕۆشنبیری لەناویانا نەبوو، خراپەو خراپەكاری و مەیخواردنەوە و قوماركردن بازاڕیان گەرم بوو، بێشەرمو ئابڕوو خۆیان ڕووت ئەكردەوە بە شێوەیە لەكاتی حەجكردندا ژنانیان بە ڕووتی ئەسوڕانەوە بەدەوروپشتی كەعبەدا، حەڵاڵ و حەرام باوی نەبوو، بەرەڵڵاییان گەیشتبووە رادەیە كە بە هیچ یاساو ڕژێمێكەوە خۆیان نەئەگرتەوە، بتیان ئەپەرست و كڕنووشیان بۆ ئەبرد، لەهەر جێگایەك بەردێكی جوانیان بەرچاو بكەوتایە ڕێزیان ئەگرت، وە داوای پێویستیان پێ‌ئەكرد، بەكورتی ئەو ملوگەردنانەی كە بۆ كەس شۆڕیان نەئەكرد هەمیشە لەبەردەم داروبەردەكاندا دایان ئەنەواند و ملیان بۆ كەچ ئەكردن، وایان ئەزانی ئەم داروبەردانە پێویستی‌یان جێبەجێ ئەكەن و بە هیواو ئامانجیان ئەگەیەنن..

ئا لەناو ئەم گەل و نەتەوەیەداو لەم كات و چەرخەدا، منداڵێكی بێ‌باوك لە دایك بوو و هاتە جیهانەوە، هێشتا منداڵ بوو پێویستی بەپەروەردەكردن و بەخێوكردن هەبوو، دایك و باپیریشی كۆچی دواییان كرد، خۆ ئەگەر دایك و باوكیشی بمانایە هەر لەم نەتەوەو دەوروبەری خۆیە ئەبوایە ئامۆژگاری و خوڕەوشتی وەربگرتایە، كاتێ گەورە بوو ئەبینی وا لەگەڵ هاوەڵەكانی خۆیدا شوانەو مەڕو ماڵات و ئاژەڵ بەخێودەكات، كاتێ گەیشتە تەمەنی لاوی خەریكی

بازرگانی بوو و تێکەڵاوی‌و رابواردنی لەگەڵ ئەو عەرەبانەدا بوو کە لە پێشەوە باسمان کردن، سەرەڕای ئەمانەش هەموو نەخوێندەوار بوو، نووسین‌و خوێندنەوەی نەبوو، بەڵام خورەوشت‌و بیروباوەڕی تەواو جیاواز بوو لە خورەوشت‌و بیروباوەڕی نەتەوەکەی، لە قسەکردنا هەرگیز درۆی نەئەکرد، نە بە زمان و نە بەدەست ئازاری کەسی نەئەدا، مەردم حەزیان بە تێکەڵی‌و هاورێیەتی ئەکرد، زمانی شیرین‌و قسەی بەتام‌و بەجێ‌بوو، هەرکەس جارێك لای دابنیشتایە ئیتر خۆشی ئەویست‌و خۆی ئەکرد بە قوربانی، هیچی لەکەس وەرنەئەگرت بە رێگەی ناڕەوا، لە دەستپاکی‌و راستی‌و خاوێنیدا لەبەرزترین پلەدا بوو، زۆر لە رۆڵەکانی ئەم نەتەوەیە حەزیان ئەکرد گەورەترین‌و بەنرخترین سپاردەیان بدەنە دەستی، ئەویش پارێزگاری ئەکردن وەکو پارێزگاری سامان‌و گیانی خۆی بکا، جێگای بڕواو متمانەی هەموو کەس بوو، بە شێوەیە کە ناویان نابوو (أمین) واتە دەستپاك‌و باوەڕ پێکراو، زۆر بەشەرم‌و شکۆ بوو، کەس بە رووتی نەیدیوە، هەمیشە لە خراپەکاری دوور ئەکەوتەوە، لەهەموو کاروبارێکا دڵسۆزو بێ‌فێڵ بوو، هەرچەندە لە نێوان خراپان‌و بێ‌رەوشتانیشدا پێگەیی بوو، بەڵام رەوشت بەرزو دڵپاك‌و بێگەرد بوو، کاتێ ئەیبینی نەتەوەکەی خوێنی یەکتر بەناڕەوا ئەرێژن‌و یەکتری تالان ئەکەن، ئێشی پێ‌ئەگەیشت‌و دڵگران ئەبوو، هەر شەڕو ئاشووب‌و ئاژاوەیە لەناویاندا رووی ئەدا بەپەرۆشەوە هەوڵی چاککردنی ئەدا، بەبەزەیی‌و دڵنەرم بوو، لەبەسەرهات‌و کارەسات‌و لێقەوماندا بەشداری ئەکردن، یارمەتی هەتیو و بێوەژنی ئەدا، خواردنی بەبرسی ئەداو میوانداری (غەریب)ی ئەکرد، لێبوردووبوو بەرامبەر بەوانەی کە ئازاریان ئەدا، دڵی هۆشیارو ئاگادار بوو، هەرچەند لەگەڵ نەتەوەکەیدا ئەژیا، بەڵام وەکو ئەوان ملی بۆ بتەکان کەچ نەئەکردو داروبەردی نەئەپەرست، سەری بۆکەس دانەئەنەواندو هەمیشە دڵی پێی ئەوت: هیچ لەم زەوی‌و ئاسمانەدا شایانی پەرستن‌و کڕنووش بۆ بردن

نی‌یه، و له دڵی خۆیدا ئه‌یوت: خوا تاکه‌و هاوه‌ڵ‌و هاوبه‌شی نابێ بۆ بڕیار بدرێ، بۆیه ئه‌م مرۆڤه له‌ناو مرۆڤه‌کانی تردا وه‌کو (دوڕ) له‌ناو به‌ردا ئه‌دره‌وشایه‌وه، وه‌کو چرا له‌ناو تاریکیدا ئه‌گڕاو رووناکی ئه‌دایه‌وه.

به‌ڵێ له‌ناو گه‌له‌که‌یدا به ژیانێکی پاك‌و پوخت ئه‌ژیا، که ته‌مه‌نی گه‌یشته چل ساڵان ئینجا ژیانی لێ ته‌نگ بوو، به‌هۆی ئه‌و نه‌فامی‌و تاریکیه‌ی که له هه‌موو رووبه‌که‌وه باڵی ره‌شی کێشابوو به‌سه‌ر کۆمه‌ڵه‌که‌یدا. پێش هه‌موو شتێ ویستی خۆی له ته‌وژمی ئه‌م نه‌زانین‌و بێ‌ره‌وشتی‌و بتپه‌رستی‌و نه‌فامیه بپارێزێ، شتێکی نه‌ئه‌بینی که له‌گه‌ل سروشتی خۆیدا رێك‌و گونجاوبێت، بۆیه له شار ده‌رئه‌چوو، بۆ ئه‌وه‌ی چه‌ند رۆژێك له ئه‌شکه‌وتی (حراء)دا به‌سه‌ر به‌رێ، به‌ته‌نیا‌و دوور له مه‌ردم، له‌وێ ده‌ستی ئه‌کرد به‌خواپه‌رستی‌و ده‌روونی خۆی پاك ئه‌کرده‌وه، هه‌روه‌ها بیری ئه‌کرده‌وه، چاوه‌ڕوانی رووناکی‌و شاره‌زاییه‌ك بوو که ئه‌م تاریکی‌و نه‌فامیه‌ی پێ بڕه‌وێنێته‌وه، وه شتێکی ئه‌ویست که ئه‌م جیهانه پڕ له‌خراپه‌و بێ ئارامیه‌ی پێ چاره‌سه‌ر بکاو رێك بخات، لێره‌دا گۆڕانێکی زۆر گه‌وره‌ی تێدا بوو، چونکه له‌ناکاو دڵی پڕبوو له‌و رووناکیه‌ی که چاوه‌ڕوانی ئه‌کرد، و هه‌ستی به هێزێکی ئه‌وتۆ ئه‌کرد که له‌وه‌و پێش هه‌ستی پێ‌نه‌کردبوو، له‌به‌ر ئه‌وه چۆڵایی ئه‌شکه‌وته‌که‌ی به‌جێ‌ئه‌هێشت و ئه‌هاته‌وه بۆناو نه‌ته‌وه‌که‌ی، بانگی ئه‌کردن‌و پێی ئه‌وتن: ئه‌م دارو به‌رده‌ی که ئێوه دڵتان پێوه به‌ستوون‌و کڕنووشیان بۆ ئه‌به‌ن نه سوودیان له‌ده‌ستدایه نه‌زیان ده‌ستیان لێ هه‌ڵبگرن‌و وازیان لێ بێنن، ئه‌م زه‌وی و خۆرو مانگ‌و ئه‌ستێره‌و هێزانه‌ی که له ئاسمانه‌کان‌و زه‌ویدا شاراونه‌ته‌وه‌و هه‌ن هه‌موو ده‌ستکرد‌و دروستکراوی خوای تاك‌و ته‌نیان، هه‌ر ئه‌و ئێوه‌ی دروست کردووه‌و هه‌ر ئه‌ویش به‌خێوتان ئه‌کات‌و رۆزیتان ئه‌دات، هه‌رئه‌وه ئه‌تان ژێنێ‌و هه‌ر ئه‌ویشه ئه‌تان مرێنێ، که‌واته هه‌ر ئه‌و بپه‌رستن‌و داوای یارمه‌تی‌و پێویستی هه‌ر له‌و بکه‌ن، دزی‌و تاڵانکردن‌و قومارو مه‌ی‌خواردنه‌وه، ئه‌مانه هه‌موو تاوانن وازیان

لێ‌بێنن، ماڵی مەردم داگیر مەکەن، هیچ لەکەس وەرمەگرن بەبێ جێگای خۆی، هەموتان ئادەمیزادن‌و ئادەمیزادیش هەموویان یەکسانن، چاکی‌و بەرزی‌و رێز بەرەنگ‌و بنەچەو ماڵ‌و سامان‌و جلوبەرگ نی‌یە، چاکی‌و بەرزی تەنها لە خواناسی‌و کردەوەی باش‌و بەکەڵکدایە، هەرکەس خواناس بێ‌و لە خراپەکردن خۆی بپارێزێ ئەوە مرۆڤێکی بەنرخ‌و رێزدارە، وەهەرکەس وا نەبێ بی‌نرخ‌و بێ‌رێزەو لە دوارۆژدا رسواو بێ‌بەش ئەبێ، دوای ئەم کورتە ژیانەی ئێستا هەموو لەبەردەم خوای گەورەدا کۆئەکرێنەوە، و لەم دادگا راست‌و رەوایەدا نە تکاو نە دۆست نە بەرتیل کەڵک‌و سوودی نی‌یە، ئەم دادگایە پرسیاری بنەچەو ماڵ‌و سامان ناکات، تەنها بڕواو کردەوەی چاکە کە بتوانێ بکەوێتە فریا. جا هەرکەس خاوەن بڕوا بووبێ و کردەوەی باشی ئەنجام دابێ ئەوە جێگای بەهەشتە، هەر کەسیش بێ‌بڕوا بووبێ‌و خراپەکاری کردبێ بە پیشە، ئەوە لە هاورێکانی دۆزەخە و ئێش‌و ئازارو سوتان ئەچێژێ..

بەڵام گەلەکەی دەستیان کرد بەئازاردانی، نەك لەبەر هیچ تەنها لەبەر ئەوە چونکە ئەو خورەوشت‌و یاسایەی لە باوباپیرەوە بۆیان هاتبوەوە پەسەندی نەئەکردو بە جوانی دانەئەنا، و مەردمی لە بتپەرستی‌و کاری نارەوا ئەگێرایەوە، وە بانگی ئەکردن بۆ ئەوەی ملکەچی‌و فەرمانبەری‌یان هەر بۆ خوا بێ‌و بەس، کە ئەمەش مانای وشەی (ئیسلامە)، لەبەر ئەوە بەردیان تێئەگرت‌و جنێوو قسەی ناشیرینیان پێ ئەوت، تەکیان پێ هەڵئەچنی‌و پیلانیان ئەگێرا بۆ کوشتنی. بەم شێوەیە هەموو جۆرە ئازارێکیان ئەداو وازیان نەئەهێنا. ئەوەبوو لەپاش (١٣) ساڵ کۆچی کرد و نیشتمانی خۆی بەجێ‌هێشت، بەڵام هێشتا دڵیان ئاوی نەئەخواردەوە، تێریان نەئەخوارد بەوە کە لە وڵاتی خۆی دەریان کردووە، بۆیە تێئەکۆشان بۆ ئەوەی کە لە (مەدینە)یش تەنگی پێ‌هەڵچنن‌و تووشی گیروگرفتی بکەن..

بەرامبەر بەم ئێش‌و ئازارە چۆن ئارامی گرت‌و وازی نەهێنا؟ بێگومان ئەمە

لەبەر ئەوەیە چونکە خوای پەروەردگار شارەزای کردبوو بۆ ڕێگایەکی ڕاستو دروست، نابینی چۆن گەلەکەی پێیان ئەوت: ئەگەر بێتو واز لەم کارە بێنێ بیکەن بە سەرۆكو گەورەی خۆیان، و ئەوەندە ماڵو سامانی بۆ کۆبکەنەوە تا لە هەموویان دەوڵەمەندتر بێ. بەڵام نەیویست و هەر لەسەر هەڵویستو بانگەکەی سوور بوو، ئایا پیاو لەوە باشترو ژیان ڕێكو پێکتر هەبوو؟ دیارە ئەم ئێشو ئازارەی لە پێناوی خۆیدا نەچێشتووە، بەڵکو لە پێناوی بانگی خواداو بۆ سوودی بەندەکانی خوا وا بەم شێوەیە تووشی ئازارو گیروگرفت بووە، بەڵام زۆربەی مەردم نەفام بوون بەردیان تێ ئەگرتو خراپترین وشەیان ئاراستە ئەکرد. ئەو هەر هیوای چاکەی پێیان هەبوو، هەوڵی ئەوەی ئەدا کە ژیرو شارەزا بنو لەو نەفامیو نەزانیە ڕزگاریان ببێ.

دوای ئەوە بیرێ لەو گۆڕینە گەورەیە بکەرەوە کە لە پێغەمبەردا ڕوویدا دوای گەڕانەوەکەی لە ئەشکەوتی (حراء) قسەکانی زۆر بەتامو پڕ وێژەو ڕەوان بوون. بە شێوەیەك هیچ کەس پێش ئەوو پاش ئەویش نەیتوانیوەو ناتوانێ بەم وێنەیە وتەی ڕەوانو پڕ وێژەو هونەر بێت، خۆ شتێکی ئاشکرایە کە عەرەبەکان لەو سەردەمەدا هەمیشە خەریکی وتاری پڕ وێژەو قسەی ڕەوان بوون، وە هەموو شانازیو هەوڵو کۆششیان هەر لەم ڕووەوە بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کاتێ پێغەمبەرﷺ بەرامبەری ئەکردنو بانگی ئەکردن: (ئەگەر بڕواناکەن ئەمانە وتەی خوا بن دەی ئێوەش کورتترین سورەتێ وەکو ئەو بڵێن)، لە ئەنجامدا دوای هەوڵدانێکی زۆرو پرسو ڕایەکی بەگەرم دانیان نا بەوەدا کە لە توانای (ئادەمیزاددا) نییە وەکو ئەم وتانەی (محمد) بڵێ، زیاتر لەوە سەریان سوڕمابوو کە ئەو زمانەی (محمد) قسەی پێ ئەکات زمانی خۆیانەو وشەو پیتەکانی هەر ئەو وشەو پیتانەیە کە خۆیان قسەی پێ ئەکەن، کەچی کاتێ بەراوردی وتارو قسەکانی ئەویان ئەکرد لەگەڵ وتارو قسەی خۆیاندا بۆیان دەرئەکەوت کە جیاوازیەکی گەورەو ئاشکرا هەیە لە نێوانیاندا، بۆیە

ناچار دانیان ئەنا بەوەدا کە ئەمانە لەوانە نین کە لە توانای مرۆڤدا بن.

ئەم نەخوێندەوارە گەورەیە کە لەدایك بوون و ژیانی لە دەشتو لەناو ئەو گەلە نەخوێندەوارەدا بوو، دەستیکرد بە دەربڕینی هەندێ پەندو ئامۆژگاری بەنرخ هێشتا هیچ کەس شتی وای بەدەما نەهاتووەو ناش یەت، بەڵکو پێش ئەوەی کە تەمەنی بگاتە (٤٠) چل ساڵان لە خۆشیان نەبیستبوو..

ئەم نەخوێندەوارە مەزنە، پێش زیاتر لە (١٣) سەدە ئەبێ کە یاسای ڕەوشتو کۆمەڵایەتیو ڕامیاریو لە هەموو ڕوویەکی ژیانەوە دانا، بە شێوەیەكو لە ڕادەیەکدا کە زاناو شارەزاو تێگەیشتووە گەورەکانی جیهان دوای بیرکردنەوەیەکی قوڵو لێکۆڵینەوەو بەراوردێکی دوورودرێژ ئەوسا کەمێك لە نهێنیو سودەکانیان بۆ دەرئەکەوێ، بەڵکو هەتا مرۆڤایەتی لەبەراوردو لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوەدا پێشبکەوێ زیاتر ئەم نهێنیو کەڵکانەیان بۆ دەرئەکەوێو تێی ئەگەن، بێگومان ئەمڕۆ نابینین کە بەندێ لە بەندەکانی پێویست بەلابردن یان بە گۆڕین یان دەستکاریکردن بکات، کەچی یاساو دەستورە دەستکردەکان تا ئێستا چەندەها جار گۆڕانو دەستکاریان بەسەردا هاتووەو دێت.

لەو ماوە(٢٣) ساڵە کەمەدا زۆر لەو دوژمنانەی کە هەمیشە لە پێستی سەری ئەگەڕان و چەندەها پیلانو شتی وایان ڕێك ئەخست بۆ کوشتنو لەناوبردنی، زۆربەیان بون بە دۆستی گیانیگیانیو خۆیان لە پێناوی ئەودا بەخت کرد، ئەمەیش هەموی بەهۆی ڕەوشتی بەرزو ئامۆژگاری جوانو بەتامی ئەوەوە، ئەو هەموو هێزانەی کە بەرامبەری ڕاوەستابوون، و بەرگری بانگە پیرۆزەکەیان ئەکردو ئازاری خۆیو هاوەڵەکانیان ئەدا، لە ماوەیەکی کەمدا بەسەریاندا سەرکەوتو مەترسیان لێنەما، بەڵام ئەو لەلایەن خۆیەوە تۆڵەی لەکەس نەئەسەند و کای کۆنی بەبا نەئەکرد، بۆیە لە هەموویان خۆشبوو و ئازادیکردن، ئەوانەی کە بەشداربوون لە کوشتنی حەمزەی مامی و برا

شیریەکەیداو سکی حەمزەیان دڕی‌و جگەرەکەیان ئەهێنا بەلاکەلاوەیاندا، لە هەموویان خۆشبوو و دڵنیای کردن، ئەوانەیش کە لەکاتی خۆیدا وشەی ناشیرینیان ئاراستە ئەکرد و بەردیان تێئەگرت‌و لە نیشتمانی خۆی دەریان ئەکرد، هەمووی ئازادکردن‌و لێی‌بوردن، فێڵی لەکەس نەئەکرد، وە پەیمانی کەسی نەئەشکاندو لە کاتی جەنگدا هەرگیز دەستدرێژی لە بێ‌تاوان نەئەکرد.
لەبەر ئەوە دوژمنترین کەسی نەیئەتوانی تاوانباری بکا بەوە کە گوایە ناڕەوایی‌و دەستدرێژی ئەکا، وەیان بێ‌پەیمانەو جێگای بڕوا پێکردن نی‌یە، بۆیە دڵی هەموو عەرەبەکانی بۆ نەرم بوو هەتا توانی لە تاریکی‌و نەفامی‌و بتپەرستیەوە نەتەوەیەکی لێ دروستکردن کە بوون بە پێشڕەو و پێشەوای هەموو نەتەوەکانی جیهان، ئەو عەرەبانەی کە بە هیچ یاساو دەستورێکەوە خۆیان نەئەبەستەوە، وایان لێ هاتبوو باشترین کۆمەڵ بوون کە بەجوانی پەیڕەوی یاساو ڕژێمی ئیسلامیان ئەکرد کە لە مێژوودا شتی وا رووی نەداوە، ئەو عەرەبانەی کە بە گوێی هیچ فەرمانڕەوایەکیان نەئەکرد، وای لێکردن وەکو پەپولە خۆیان ئەسوتاند لە پێناوی روناکی ئیسلامدا، ئەوانەی کە ئاگای خوڕەوشتی بەرزیان نەئەزانی، رەوشتی هەموویانی جوانکردو بوون بە ئەستێرەی پرشنگدار لە ئاسمانی مێژوودا، ئەو نەتەوەیە لە دواکەوتووترینی نەتەوەکانی جیهان بوو لەماوەی ئەم (٢٣) ساڵەدا زاڵ بوون بەسەر دەوڵەتی رۆم‌و فارس‌و میسردا، و دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی شارستانێتی‌و رەوشتی بەرزو مرۆڤایەتی، وەهەروەها بەرنامەو بیروڕای ئیسلامیان لە ناوچەکانی ئاسیاو ئەفەریقاو ئەوروپای دووردا بڵاوکردەوە، ئەمە بوو کاری ئەم نەخوێندەوارە مەزنەﷺ لە دڵ‌و دەروونی نەتەوەی عەرەبدا، ئەی ئاخۆ لە دڵی نەتەوەکانی تردا چ کارێکی کردبێ، بەڕاستی لە دڵی نەتەوەکانی‌تردا زیاتر کاری کردووەو باشتر بووە بە جێگای لێکۆڵینەوەو سەرسامی، بەڕاستی شۆڕشێکی مەزنی بەرپاکرد لەیاساو خوڕەوشتی هەموو نەتەوەکانی سەر

زەوی‌دا، هەتا ئەوانەیش کە دوژمنایەتیان لەگەڵ ئەکردو شوێنی ئاینەکەی نەئەکەوتن تا رادەیە کەڵکیان لە ئامۆژگاریەکانی وەرگرت‌و کەمێ گۆڕان‌و دەستکاریان دروستکرد لەهەموو یاساو رژێمەکانیاندا، هەموو جیهان خوا بەیەك ناسینیان لەبیر چووبووەوە، بەڵام ئەم نەخوێندەوارە سەرلەنوێ بیری خستنەوەو خەبەری کردنەوە، بە شێوەیە ئێستاش ئەو ئاینانەی کە پڕن لە بتپەرستی، ئەوانیش خۆیان وا پیشان ئەدەن هەر تەنها خواپەرستن‌و بڕوایان بە یەکتاپەرستی هەیە.

هەروەها ئەو بنکەو رێبازە رەوشتیانەی کە بە مەردمی گەیاندووە هێشتا کاری هەرەگەورەیان هەیە لە رەوشتی گەلێ لە نەتەوەکانی رووی زەوی‌دا، وە ئەو بنکەو رێبازانەی کە لە یاساو رامیاری‌و پێشەوایەتی‌و کۆمەڵایەتیدا دایناوە لە رادەیەکی ئەوتۆدان کە دوژمنەکانی ئیسلام وە ئەوانەیش کە بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی نی‌یە کەڵکی لێ وەرئەگرن‌و دەستە بارەی لێ ئەبەن.

ئەو مرۆڤەی کە ئێستا بۆمان باسکردی لەگەڵ سروشت پێگەییوە، و لەناو نەتەوەکەیدا گەورەبووەو گەشەی کردووە کە هێجگار نەفام‌و جانەوەر بوون، وە بە بەخێوکردنی مەڕو ماڵات‌و بازرگانی نەبێ، هەتا تەمەنی گەیشتوەتە (٤٠)ساڵان، بەهیچەوە خەریك نەبووە، ئەوەی پێی بڵێی فێربوون‌و پەروەردە لە کەسەوە وەری‌نەگرتووە، کەوابوو ئەم هەموو نیشانەی تەواوی‌و هونەرمەندیانەی لە تەمەنی چل ساڵیدا چۆن کت‌وپڕ بەجارێ بۆ پەیدا بوو؟! لە کوێوە ئەم هەموو تێگەیشتن‌و زانیاریەی دەستکەوت؟ لە کوێوە ئەم هەموو هێزەی کە لەتوانای ئادەمیزاددا نی‌یە دەست کەوت؟! ئەبینی لەکاتێکا کە سەرۆکایەتی سوپای ئەکرد لەوە ئەچوو هەموو تەمەنی خۆی لەسەربازیدا بەسەر بردبێ، وە لە کاتێکا یاساو دەستوری دائەنا وێنەی نەبوو، لەلایەکی ترەوە فەیلەسوفێکی هەڵکەوتوو بوو وەك تەمەنی خۆی لە زانیاری‌و فەلسەفەدا بەسەر بردبێ، هەروەها مامۆستایەکی بێ‌وێنەبوو لە چارەکردنی ئاژاوەو دانانی

رەوشتو كۆمەڵایەتیدا، هەر لەهەمان کاتدا پێشەوایەکی دڵسۆزو بلیمەت بوو، کە لە مێژوودا وێنەی نەبووەو نابێتەوە، سەرەڕای ئەمانە هەموو خواناسێکی وابوو زۆربەی شەوەکانی بە شەونوێژو خواپەرستی رۆژی ئەکردەوە، لەگەڵ ئەو هەموو کاروبارەی مەردمیش کە ئەبوایە بەرۆژ جێبەجێی بکردایە، وە ئەوەی بەسەریەوە بوو لە مافی خێزانو خزمو ئاشناو ناسراو هەمووی لە جێگای خۆیدا رائەپەڕاندو جێبەجێی ئەکرد، یارمەتی هەژارو لێقەوماوانی ئەداو دەستگیرۆیی هەتیو و بێوەژنی ئەکرد، خۆیشی بە ژیانێکی سادەو دوور لە کەشوفش ئەژیا، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەوپەڕی دەسەڵاتو توانای هەبوو کە بە خۆشترین ژیان بژی، کەچی لەسەر حەسیر ئەخەوتو خواردنی سادەی ئەخوارد، بەڵکو رۆژانی وا هەبوو بە رۆژوو ئەبوو هیچی نەئەخوارد، کەوابوو ئەگەر دوای ئەم هەموو ئیشوکارە گرنگانە بە مەردمی بوتایە: من وەکو ئێوە نیم، من لە جۆری مرۆڤ بەرزترم، هەموو کەس بڕوای پێئەکردو بە درۆیان نەئەخستەوە، بەڵام وای نەوتووەو بەڵکو بەمەردمی راگەیاندووە کە ئەم بیروهۆشو زانیاریەی هەموو لەخواوەیەو لە خۆیەوە نییە، وە پێی راگەیاندوون ئەم قورئانەی بۆم هێناون کە پەری (الجن)و ئادەمیزاد ناتوانن شتی وا بڵێن هیچی لە خۆمەوە نییەو لەبیرو هۆشی خۆمەوە هەڵناقوڵێ، بەڵکو هەمووی فەرموودەی خوایەو سوپاس هەر بۆ ئەوە، وە هەر کردەوەیە کەئەنجامی ئەدەم هیچی لەلێهاتوویی خۆمەوە نییە، تەنها خوایە سەرم ئەخات بۆ ئەم کارە گرنگانە، من هەرچی بڵێمو هەرچی جێبەجێبکەم هەموو لەخواوەیەو و بۆ خوایە.

دوای ئەمانە هەمووی پێم بڵێ: پیاوێ بەم جۆرە بێ چۆن بڕوای پێ نەکەینو دان بەوەدا نەنێنن کە لەلایەن خواوە نێردراوەو پێغەمبەری ئەوە؟ سەیری لێهاتوویی و هونەرەکانی بکە، ئەبینی هێشتا مرۆڤایەتی یەکێ‌تری وای لێ هەڵنەکەوتووەو هەڵناکەوێ، سەرنجی راستیو دەستپاکی بدە.. شانازی بە

خۆیەوە ناکاو نایەوێ سوپاسی بکرێ، چونکە هەموو شتێ ئەگێڕێتەوە بۆ خواو لەوی ئەناسێ، ئیتر چۆن بڕوا بە فەرموودەکانی نەکەین ئەو کاتەی کە پێمان ئەڵێ ئەم هەموو زانیاری‌و نیشانەی تەواوی‌یە کە لە منا ئەیبینن هەموو لە خواوەیەو لە خۆمەوە نی‌یە، چۆن بەدرۆی بخەینەوەو بڵێین نەخێر ئەمانە هەمووی داهێنراوی خۆتەو لەبیرو مێشکی خۆتەوە هەڵئەقوڵێ‌و دەرئەچێ. ئەم پیاوە راستگۆیە خۆی نایەوێ ئەم هەموو چاکەو هونەرە بگەڕێتەوە بۆ خۆی‌و خۆی پێ‌بەرز بکاتەوە، کە زۆر باش بۆی ئەکراو بڕواشیان پێ‌ئەکرد، هەر تەنها خۆی لەسەرچاوەکەی ئەزانێ، ئەگەر ئەم پیاوە بەم بەڵگانەوە داوای بکردایە خۆی لە جۆری ئادەمیزاد بەرزترە، زۆر بەئاسانی بۆی ئەگونجاو کەس بەدرۆی نەئەخستەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پێچەوانەی ئەمەی داوا کردووە، کەوا بوو لەم پیاوە راستترو پاك‌و خاوێنتر ئەبێ کێ بێ؟!

بێگومان ئەم پیاوە راست‌و راستگۆیە، پێشەواو پێغەمبەری گەورەمان (محمدی کوڕی عبدالله) هەزاران درودی خوای لەسەر بێ، وە تەنها راستیەکەی بەسە بۆ ئەوە بەڵگە بێ لەسەر پێغەمبەرایەتی. بەڕاستی هەرکەسێ بە دڵ‌و دەروونێکی خاوێنی بێگەردەوە بە دوای رەواو راستیدا بگەڕێ‌و سەیری پەڕاوەکانی مێژوو بکات، هیچ گومانی نامێنێ کە ئەم مرۆڤە گەورەیە فروستادەو نێرراوی خوای پەروەردگارەو ئەو فەرموودە گەورەیەی کە بە نەتەوەکەی رائەگەیاند ئەم قورئانە پیرۆزەیە کە لەبەردەستماندایە، هەرکەس بە دڵێکی وشیارو بیرێکی گلێرەوە بیخوێنێتەوە، بەبێ دوودڵی دان بەوەدا ئەنێ کە ئەم فەرموودەیە لەلایەن خواوە هاتووەو هیچ کەس لە مەردمدا توانای نی‌یە کە شتی وا دابنێ‌و بیڵێ.

## دوایی هاتنی پێغەمبەرایەتی ( ختم النبوة )

ئەمەو پێویستە ئەوەیش بزانین کە هیچ هۆیە نییە بۆ ناسینی ئیسلامو تێگەیشتنی ڕێگا ڕاستەکەی جگە لەفەرموودەی پێغەمبەرو قورئانی پیرۆز، وە(محمد ﷺ) پێغەمبەری خوایە و ناردویەتی بۆ هەموو ئادەمیزاد لەسەر ڕووی زەوی، وە زنجیرەی پێغەمبەرایەتی بەناردنی ئەم پێغەمبەرە مەزنە دوا هەڵقەی هاتووەو ئیتر پەیامو نێراوێکی تر نابێ و ڕەوانە ناکرێ، وە خوای گەورە بە هۆی ئەم پێغەمبەرەوە هەرچی پێویست بێ لەبابەت ڕووناکیو شارەزاییەوە ناردوویەتیو تەواوی کردووە، جا ئیتر هەرکەس ئەیەوێ بەندەیەکی باش بێو پەیڕەوی فەرمانەکانی خوا بکات پێویستە بڕوا بەم پێغەمبەرە بهێنێ کە دوای هەموو پێغەمبەرەکان نێرراوە، و ئەبێ بڕوای ببێ کە پێغەمبەرێکی تر ڕەوانە ناکرێ. وە بەتەواوی بڕوا بە ڕێبازو بەرنامەکەی بکاو شوێنی بکەوێ بەبێگومانو دوودڵی.

## چەند بەڵگەیەك لەسەر دوایی هاتنی پێغەمبەرایەتی

کە بنجو بناوانی پێغەمبەرایەتی تێگەیشتی، ئینجا بۆت دەرئەکەوێ کە هەموو ڕۆژێ پێغەمبەران لە دایك نابن، و پێویست ناکات بۆ هەموو نەتەوەیەكو لەهەموو کاتو چەرخێکدا پێغەمبەرێکی تایبەتی ڕەوانە بکرێ، چونکە ژیانی هەموو پێغەمبەرێك بریتییە لە ژیانی پەیامو بەرنامەکەی، کەواتە هەر پێغەمبەرێ پەیامو بەرنامەکەی زیندوو بێ خۆیشی زیندووە، پێغەمبەرە زۆر پێشووەکان بۆیە بە نەماو دائەنرێن چونکە مەردمەکە ئاینەکانیان گۆڕیونو گەلێ شتی گۆترەو ئارەزو و هەوەس کاری خۆیان تێکەڵ کردووە، وە ئەمڕۆ پەڕاوێك لەو پەڕاوانەت دەست ناکەوێت کە لە شێوەی ڕاستی خۆیدا مابێتەوە، وە نەتەوەکانیان ناتوانن داوای ئەوە بکەن کە پەڕاوی پێغەمبەرەکانیان وەکو خۆی لا ماوەتەوە، هەروەها مەردم خوڕەوشتی ئەم پێغەمبەرانەیان لە بیر

چوەتەوە. بە شێوەیە کە ناتوانی روویەکی راست لە ژیانیان بدۆزیتەوە، تەنانەت ناتوانی بەتەواوی دان بەو کاتو شوێنەدا بنێی کە تیایا لە دایک بوون، و چ کردەوەیەکیان کردووە لە ژیانی خۆیاندا، هەروەها نازانرێ کە فەرمانی چییان داوەو چییان قەدەغەکردووە، مەبەست لە نەمانیان ئائەمەیەو بەس.

بەلاَم پێغەمبەرمان محمدﷺ هێشتا زیندووەو نەمردووە. چونکە بەرنامەو پەیامەکەی لەبەردەستماندایەو بەتەواوی روون و ئاشکرایە، ئەوەتا قورئانی پیرۆز وەکو یەکەمجاری خۆی ماوەتەوەو بە هیچ شێوەیە گۆڕان رووی تێنەکردووە. نەك رستەیەکی بەڵکو پیتێ لە پیتەکانی، یا خاڵێ لە خاڵەکانی. یان سەر وژێرێکی بە هیچ شێوەیە نەگۆڕاوەو، وەکو خۆی ماوەتەوە، هەروەها ژیانی پێغەمبەر خۆیشی لە هەموو پەرەکانو لاپەرەکانی مێژوودا نووسراوەتەوەو پارێزگاری کراوە، بە شێوەیە ئەڵێی ئەمڕۆ چاومان لە خۆیەتی لە ناوماندا ئەژی، بە گوێی خۆمان فەرموودەکانی ئەبیسین، کەس نی‌یە لە جیهاندا وەکو پێغەمبەر رووداوەکانی ژیانی هەڵگیرابێو پارێزگاری کرابێ، لەبەر ئەوە زۆر باش ئەزانین شوێنی بکەوینو پەیڕەوی فەرموودەو فەرمانەکانی بکەین، تەنها ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزو تەواوە لەسەر ئەوە کە مەردم ئەمڕۆ پێویستیان بە ناردنی پێغەمبەرێکیتر نی‌یە، وەئەگەر پێغەمبەرێکیتر رەوانە بکرێ ئەبێ لەبەر یەکێ لەم سێ هۆیانەی خوارەوە بێ:

هۆی یەکەم: ئەوەیە کە پەیامو بەرنامەی پێغەمبەری پێشوو نەمابێ، وە پێویست بێ جارێکیتر نیشانی مەردم بدرێتەوە.

هۆی دووەم: ئەوەیە کە پەیامو بەرنامەی پێغەمبەری پێشوو ناتەواو بێو پێویست بێ تەواو بکرێ.

هۆیسێیەم: ئەوەیە کە پەیامو بەرنامەی پێغەمبەری پێشوو تایبەت بێ بۆ گەلێکی تایبەتی وە گەلو نەتەوەکانی تر پێویستیان بە ناردنی پێغەمبەرێکی تر بێ.

خۆ ئەمڕۆ ئەم سێ هۆیە هیچ کامیان نی‌یە وە دەست ناکەوێ:

١. پەیامو بەرنامەی ئەم پێغەمبەرە ﷺ زیندووەو هێشتا لەبەردەستماندایەو لە پێش چاوماندایە، وئەو هۆیانەی کەئەم پەیامو بەرنامەیەی پێبناسین ئاشکراو ئامادەن، وە زۆر باش ئەزانین کامەیە ئەو شارەزایی و ڕووناکیەی کە لەلایەن خواوە هێناویەتی، وە ئەزانین کام ڕێگای بڕیار داوە کە لەسەری بڕۆین و کامەیە ئەو ڕێگایانەی کە مەردمی لێ قەدەغەکردووە، جا لەبەر ئەوەی پەیامو بەرنامەکەی ئا بەم شێوەیە زیندووەو هێشتا لەبەر دەستماندایە، کەواتە پێویست بەناردنی پێغەمبەرێکی‌تری تازە ناکات بۆ ئەوەی بۆ جاری دووەم نیشانی مەردمی بداتەوەو بیریان بخاتەوە.

٢. خۆ ئەم پەیامو ئاینەی ئەم پێغەمبەرە هیچ کەم‌وکوڕیەکی تێدا نیەو هەموو ڕوویەکی ژیانی گرتوەتەوە، لەبەر ئەوە پێویست ناکات بەوە کە شتێکی لێ لابرێ یان بۆی زیادبکرێ، وەهەروەها ناتەواویەکی تێدا نی‌یە کە پێغەمبەرێکی‌تر بێت بۆ تەواوکردنی، بەم شێوەیە هۆی دووەمیش نەما.

٣. بێگومان پێغەمبەرێتی محمد ﷺ بۆ هەموو جیهانە وە تایبەت نی‌یە بۆ تەنیا گەلێ یان کۆمەڵێ، یان بۆ چەرخێ نەك چەرخێکی‌تر، بۆیە هیچ نەتەوەیە لە نەتەوەکانی جیهان و هیچ گەلێ لەگەلەکانی ئەم جیهانە پێویستیان بەناردنی پێغەمبەرێکی‌تر نی‌یە، بەم جۆرە هۆی سێیەمیش نەما.

* هەر لەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەرمان محمد ﷺ ناوبراوە بە (خاتم النبیین) واتە پێغەمبەرێکە لەدوای هەموو پێغەمبەرەکانی تر هاتووە.

* کەواتە ئەمڕۆ پێویستی نی‌یە بە هاتنی پێغەمبەرێکی‌تر بە ئاینێکی تازەی ترەوە، تەنها پێویستی هەیە بە هەندێ مرۆڤی باش و خواناس کە بە ڕێك و پێکی شوێنی ئەم پێغەمبەرە بکەون و مەردمیش بانگ بکەن بۆئەوەی لەم ئایینە شارەزا بن و ڕەفتاری پێبکەن، و سەرلەنوێ دەوڵەتێکی بەهێزو بتەو لەسەر ئەم دەستورو بەرنامەی ئیسلامە دابمەزرێنن.

## بەشی چوارەم

# بڕوا بە درێژیی
# (الإيمان مفصلاً)

* بڕواکردن بە خوای پەروەدگار.
* مانای ( لا اله الا اللّه).
* بنج و بناوانی ( لا اله الا اللّه).
* کاری بڕوای خوا بەیەك زانین لەژیانی مرۆڤدا.
* بڕواکردن بە فریشتەکانی خوا.
* بڕواکردن بە پەڕاوەکانی خوا.
* بڕواکردن بە پەڕاوەکانی خوا (الإيمان بكتب اللّه)
* بڕواکردن بە نێرراوەکانی خوا.
* بڕواکردن بە رۆژی دوایی.
* پێویستیمان بە بڕواکردن بە رۆژی دوایی(اليوم الآخر).
* راستی بڕواکردن بە رۆژی دوایی.
* وشەیەکی پاكو بێگەرد.

بەرلەوە هەنگاوێ بۆ پێشەوە بنێی بەباشی ئەزانم ئەی خوێنەری بەڕێز کەکەمێ بگەڕێیتەوە بۆ دواوە، تا ئەوەی کەلە پێشەوە باسمان کرد جارێکیتر پێش چاوی خۆتی بخەیتەوە:

١. بێگومان (ئیسلام) بریتییە لە پەیڕەوی خواو بەگوێکردنی فەرمانەکانی. بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ ڕێگایەك نییە بۆ ناسینی خوای پەروەردگارو ناوەڵناوەکانی، وە بۆ ناسینی ئەو شتانەی کە ئەبێتە هۆی پێخۆشبوونی خوای گەورە لەکاتی بەسەربردنی ئەم ژیاننامەی ئێستاماندا، وە بۆ زانینی چۆنیەتی پاداشت و تۆڵەی مەردم بەرامبەر بە کردەوەکانیان، تەنها بەرێگای پێغەمبەرێ نەبێ کە ڕەوانە بکرێ لەلایەن خواوە، لەبەر ئەوە کلێشەی (ئیسلام) بەم جۆرەی خوارەوەی لێبێت: (ئیسلام ئەوەیە کە بڕوا بکەیت بەو پەیامو بەرنامەیە کە پێغەمبەر هێناویەتی لەلایەن خواوە. وە خوای پەروەردگار بە گوێرەی فەرمان و پێڕاگەیاندنی پێغەمبەرﷺ بپەرستی). کەوابوو هەرکەسێ لە فەرمان و ڕێ نیشاندانی پێغەمبەر ﷺ لابداو نەیکات بە هۆی ناسینی خواو ناوەڵناوەکانی و یاساو بەرنامەی خوای پێبدۆزێتەوە، ئەوکەسە موسوڵمان نییە، ئەگەرچی بە وتارو دیمەنیش وا پشان بدات کە بەگوێی فەرمانی خوا بکات و ملکەچی یاساو بەرنامەکەیەتی.

٢. ئەوە بوو پێغەمبەران یەك لەدوای یەك و جارجاریش لەیەك کاتدا ئەنێرران بۆ نەتەوەو گەلانی رووی زەوی، وە هەر پێغەمبەرێ ئەنێررا بۆلای گەلێ بەتایبەتی، جاری واش هەبوو چەند پێغەمبەرێ، یەك لەدوای یەك ئەنێرران بۆ یەك گەل و یەك نەتەوە، وە وشەو ناوەڵناوی ئیسلامیش ناو بووە بۆ هەموو یەکێ لەم ئاینانەی کەبەم نێرراوانەدا رەوانەکراوە. وە ئاینی ئیسلامیش هەرچەندە لە بنج و بناواندا لە هەموو چەرخێکدا هەریەك ئاین بووە. بەڵام جۆرە جیاوازیەکی زۆر کەم بووە لەناو هەموو ئاینەکاندا، ئەویش تەنها لەبارەی شێوەی گەیاندن و دروشم و نیشانەی پەرستنەوە بووە، هیچ گەلێ بۆی نەبووە شوێنی پێغەمبەرێکیتر بکەوێ، بەڵام پێویست بووە هەموو گەلێ لە

*ئاستی خۆی بڕوای بە هەموو نێرراوەکانی خوا ببێ بەبێ جیاوازی.*

*٣. خوای پەروەردگار بەهۆی ناردنی پێغەمبەر محمدﷺ پەیامو بەرنامەی هەموو پێغەمبەرە پێشوەکانی تەواوکرد، بۆ ئەوەی مەردم لەم قۆناغەدا تاکە بەرنامەو پرۆگرامیان ببێ کە گەلەکان تێکڕا لەسەر ئەو تاقە ڕێگاو بەرنامەیە بڕۆن. کەواتە ناردنی ئەم پێغەمبەرە تەنها بۆ گەلێکی تایبەتی نی‌یە، وە بۆ کاتو چەرخێکی دیاریکراو نی‌یە، بەڵکو بۆ هەموو مەردمە لە هەموو چەرخێکدا، وە بەهۆی ئەم ئاینو بەرنامەیەوە هەرچی ئاینو بەرنامەی پێغەمبەرەکانی تر هەیە سڕاونەتەوە، وە بەگوێکردنیان قەدەغەکراوە، وەدوای ئەم ئاینو بەرنامەیە ئاینو بەرنامەیەکی تر لەلایەنی خواوە ڕەوانە ناکرێ هەتا ڕۆژی دوایی، وە مانای وشەو ئاوەڵناوی ئیسلام ئەمڕۆ بریتی‌یە لە شوێنکەوتنو بەگوێکردنی محمدﷺ، ئەو پێغەمبەرەی کە دوای ئەو مرۆڤێکی‌تر نایە کە پێویست بێ بڕوای پێبکرێ، هەر مرۆڤێ بڕوای بەم پێغەمبەرە نەبێ کافرە و بە موسوڵمان دانانرێ.*

*ئینجا ئێستا فەرموو با باسی ئەو شتانەت بۆ بکەین کە ئەم پێغەمبەرە فەرمانی داوە کە پێویستە بڕوایان پێ‌بکەین.*

## بڕواکردن بەخوای پەروەردگار

**یەکەم شتێك کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێداوین کە بڕوای پێبکەین ڕستەی (لا اله الا الله)یە، واتە: (کەس شایانی پەرستن نی‌یە خوانەبێ)، وە تەنها ئەم ڕستەیە کە بووە بە بنکەی ئاینی ئیسلام، و هەر ئەمەیە کە موسوڵمان جیا ئەکاتەوە لە (کافرو مشركو ملحد)، و هەر ئەوەیشە ئەبێتە هۆی جیاوازیەکی گەورە لە نێوان ئەو کەسەی کە بڕوای پێ‌ئەکاو ئەوەی بڕوای پێ‌ناکا، ئەوانەی کە بڕوای پێ‌ئەکەن کۆمەڵێکن کە ڕزگاریو بەختیاری و پایەبڵندی لە هەردوو جیهاندا هەر بۆ ئەوانە. وە ئەوانەی کە بڕوای پێ‌ناکەن تاقمێکن کە زەرەرمەندیی و ڕسوایی و نزمی لە هەردوو جیهاندا هەر بۆ ئەوانە، وە ئەم**

جیاوازیە گەورەیەش تەنها بەوە پێك نایە کەبەدەم رستەیەك بڵێی کە وشەکانی پێك هاتبێ لە پیتی (لامو ئەلفو هاو ئەوانیتریش)، بۆ نمونە: ئەگەر تووشی نەخۆشی لەرزو تا (مەلاریا) بوویت، ئایا هەرگیز بەوە چاك ئەبیتەوە کە تەنهابە زمان بڵێی (کینا.. کینا) بێئەوەی بەکاری بهێنی، با هەزار جاریش بیڵێی و دووبارەی بکەیتەوە، هەروەها ئەم رستەیەش سوودت پێناگەیەنێ تەنها بەوتەیەکی سەرزاری پەتی، بێئەوەی لە ماناکەی بگەیت وە تێبگەیت کە چیت وتووە، وەبەم دان پیانانە چ لێپرسینەوەیەکی گەورەت خستۆتە سەر شانی خۆت. بەڕاستی ئەم جیاوازیە پەیدا نابێو نایەتە کایەوە هەتا مانای رستەکە نەچێتە ناو بنکەی دڵتەوە، وە هەتا بڕوات بەهێز نەبێ کە کەمتر نەبێ لەو بڕوایەت کە ئەڵێی ئاگر شتێکی سوتێنەرە، وە خواردنی (زەهر) مرۆڤ ئەکوژێت، واتە هەرچۆنێ بێ بڕوای یەکەم وات لێ ئەکا کە نەچیتە ناو ئاگرەوە. بڕوای دووەمیش وات لێ ئەکات کە زەهر نەخۆیتەوە، هەروەهایش بڕوات بەم رستەیە ئەبێ وات لێبکات کە هەتا ئەتوانی لە گوناهی گەورەو بچوك خۆت بپارێزی وە هاوەڵ بۆ خوا بڕیار نەدەی نە لە کردەوە وە نە لەبیروباوەڕدا.

## مانای (لااله الا الله)

پێویستە لێرەدا بزانی کە مانای وشەی (اله) چیە؟! لە زمانی عەرەبیدا (الە) ئەوەیە کە شایانی پەرستن بێ، واتە یەکێکە لەوپەڕی دەسەڵاتو هێزو پلەی بەرزیدایە، لەبەر ئەوە شایانە کە مەردم بیپەرستنو کڕنووشی بۆ بەرن. مانایەکیتری وشەی (الە) ئەوەیە کە خاوەنی هێزو توانایەکی ئەوتۆیە کە عەقڵو ژیریی مرۆڤ تێیناگاو پەی پێ نابا. هەروەها مانای (الە) وا ئەگەیەنێ کە هەرگیز پێویستی بەکەسو هیچ شتێ نییە، بەڵام هەموو کەس پێویستی بەو هەیەو ناچارن کە داوای یارمەتی لێ بکەن لەهەموو کاروبارێکیاندا. هەروەها مانای (اله) ئەوەی تێدایە کە یەکێکە مرۆڤ ئەو توانایەی نەدراوەتێ

**که بتوانیٰ ببینینیٰ[٦]، وه وشەی (خوا) به زمانی کوردیو (خدا) به زمانی فارسیو (دیوتا) به هیندیو (God) به ئینگلیزی هەموویان مانای وشەی (اله) ئەگەیەنن، هەروەها له زمانەکانی جیهاندا وشەیەکی دیاری هەیە کە مانای (اله) ئەگەیەنیٰ، (الله) ناوی خوای پەروەردگارە.**

**کەواتە رستەی (لا اله الا الله) ئەوەیە کەلەم بوونەوەردا هیچ کەسو هیچ شتیٰ نییە شایانی ئەوە بیٰ کە مەردم بیٰپەرستنو کڕنووشی بۆ بەرن بە شێوەی فەرمانبەری و بەگوێکردن تەنها خوای گەورە نەبیٰ، و ئەم بوونەوەرە خاوەنو فەرمانڕەوایەکی نییە تەنها خوای گەورە نەبیٰ، وە ئەو خوایە عەقڵو ژیریی مرۆڤ تیایا سەرسامەو نایگاتیٰ، وە ناتوانیٰ خودی خۆی (ذاتە) تێبگاو بەتەواوی[٧] دەرکی بکات.**

## بنج و بناوانی ( لا إله الا الله )

**ئەمەی کە وتمان ئەوەیە مانای رستەی (لا اله الا الله) لەسەر زمانی عەرەبەکان، وا ئێستا فەرموو با بنجو بناوانی ئەم رستەیەت بەتەواوی بۆ روون بکەمەوە.**

**ئەوەی کە پێمان گەیشتووە لە مێژووی مرۆڤ لە کۆنترین چەرخیەوە تا ئێستا، وە ئەوەی لەم جیهانەدا ئەبینریٰ لە پاشماوەی هەموو گەلو نەتەوەکانی سەرزەوی بە کۆنو تازەیانەوە هەمووی ئەوەمان پیشان ئەدات کە مرۆڤ کاتێکی بەسەردا نەهاتووە کە خوایەکی بۆ خۆی بڕیار نەدابیٰ و نەپەرستبیٰ. هەروەها ئەمڕۆیش هەموو گەلو نەتەوەکانی سەر زەوی لەهەموو ناوچەیەکدا بڕوایان بەخوایەك هەیە و ئەیپەرستن، ئەمەیش ئەوەمان ئەگەیەنیٰ کە نیازو بیرکردنەوە لە پەرستراو (تصور الالە) شتێکی گونجاوەو لەناو دەروونی مرۆڤەوە هەڵ ئەقوڵیٰ، وەئەوەمان تیٰئەگەیەنیٰ کە شتیٰ هەیە پاڵ بە**

---

[٦] (المصطحات الأربعة في القرآن)ی دانەر.

[٧] (لا تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ) الأنعام/ ١٠٣ (وەرگێران)

مرۆڤەوە ئەنێ کە ئەبێ پەرستراوێ بۆ خۆی بڕیار بدات ئایا هۆی ئەمە چی‌یە؟!

ئەگەر کەمێ لەبارەی خۆت‌و چۆنیەتی مرۆڤ ورد ببیتەوە هۆی ئەمەت بۆ دەرئەکەوێ، مرۆڤ بەبەندە دروستکراوە چونکە لە سروشتا بێ‌هێزەو پێوستی بەگەلێ شت هەیە، ئەبینی زۆر شت هەیە کە بۆ مانەوەی ژیانی پێویستیەتی و دەستی ناکەوێ، جاری وا هەیە دەستی ئەکەوێ‌و جاری وایش هەیە لێی ئەسێنرێتەوە، زۆر شت هەیە کە سودو کەڵکی هەیە بۆی‌و ئەیەوێ دەستی خۆی بخا، جاری وا هەیە پێی‌ئەگاو جاری وایش هەیە پێی‌ناگا، چونکە پێگەیشتنەکەی لە ژێر توانای ئەودا نی‌یە، گەلێ شتی وایش هەیە کە زیانی پێئەگەیەنێ‌و ئامانج‌و هەوڵدانەکانی بە فیڕۆ ئەدا، وە لە پێناوی ئەوەدا تووشی گەلێ گیروگرفت‌و تەنگ‌و چەڵەمەو ناخۆشی ئەبێ، ئەوەیش ئەیەوێ کە لە خۆی دووریان بخاتەوە جاری وا هەیە بۆی دوور ئەخرێتەوە جاری وایش هەیە هیچ، ئەمەیش وائەگەیەنێ کە لاچوون‌و دوورخستنەوەی ئەو شتە لە تواناو دەسەڵاتی خۆیدا نی‌یە، هەر بەم شێوەیە گەلێ شتی تر هەیە کە بە گەورەی سەیر ئەکات‌و دڵی پڕ ئەکا لە ترس‌و لەرز، چاوی بەشاخە بەرزەکان‌و رووبارە گەورەکان‌و دڕندە سامناکەکان ئەکەوێ، رەشەباو لافاو و بوومە لەرزەی بەرچاو ئەکەوێ، گوێی لە هەورەگرمە ئەبێ‌و چاوی بە بروسکەو هەورە رەشەکان ئەکەوێ، جا ئەو کاتە ئەم شتانەی زۆر بە گەورەو بەهێز دێتە پێش چاو، وە خۆی بە بێ‌هێزو ناتەواو ئەبینێ لەبەر دەم ئەو شتە گەورەو سامناکانەدا، ئەمەیش وای لێ ئەکا کە لەم شتانە بکۆڵێتەوەو بیریان لێ بکاتەوە.. وەکاتێ کە بیر لەم شتە جۆربەجۆرانە ئەکاتەوەو ئاورێکیش بەلای خۆیدا ئەداتەوە ئەو هەستەی تێدا دروست ئەبێ کە خۆی بەندەیەکی بێ‌هێزەو پێویستی بە یەکێکی‌تر هەیە، وە بەهۆی پەیدا بوونی ئەم هەستەوە هەستێکی‌تر لە دڵی‌دا پەیدا ئەبێ، کە ئەویش بیرکردنەوەو نیازکردنی (الە)ە واتە: پەرستراوێکی ئەوتۆ کە دەسەڵاتی هەبێ بەسەر ئەم هەموو شتە گەورەو بەهێزانەدا، هەروەها هەستی پاڵی پێوە ئەنێ کە ملکەچ بکات بۆ ئەم پەرستراوە بە شێوەی

بەگوێکردن و پەرستن، وەئەم هەستەیش پاڵی پێوە ئەنێ کە بێ‌هێزی و ناتەواوی پیشان ئەدات و پەنای پێ‌ئەبات و داوای چاکەی لێ ئەکات.

ئادەمیزاد لە کاتێکا لەنزمترین پلەی نەفامی و نەزانین دایە، ئەم شتە گەورەو بەهێزانەی بەرچاو ئەکەوێ، بڕیار ئەدات کە ئەمانە چەند خوایەك بن شایانی پەرستن بن، لەبەر ئەوە ئەبینی جاری وا هەیە زیندەوەر، یا رووبارو شاخ و شتی وا ئەپەرستێ، یا زەوی و ئاگرو رەشەباو مانگ و ئەستێرەو هتد. ئەپەرستێ، بەلاّم لە کاتێکا تەمی ئەم نەزانیە لەسەری ئەڕەوێتەوەو کەمێ رووناکی زانین ئەبینێ ئینجا تێ‌ئەگا کە ئەم شتانە هەموویان وەکو خۆی بێ‌هێزو بێ‌دەسەلاّتن، وە مردن و لە ناوچوون تووشی گەورەترین و بەهێزترین زیندەوەر ئەبێ، هەروەکو تووشی بچوکترین و لاوازترینیان ئەبێ، وە ئەم رووبارە گەورانە جاری وا هەیە وشك ئەبن و ئاوەکەیان دائەبەزێتە خوارەوە، و هەمیشە لەکەمکردن و زیادکردندان، هەروەها مرۆڤ ئەتوانێ شاخەکان بشکێنێ و دایان بهێنێ، وە ئەم زەویە ناتوانێ هیچ رواوێکی بڕوێنێ بەبێ ئاو، وە رووەك و دارو درەختەکان وشك ئەبن ئەگەر ئاوی تەواویان دەست نەکەوێ، وە باران لە خۆیەوە ناباری بەبێ هاتنی (با) کە پاڵ بە هەورەکانەوە بنێ و لە جێگایەکەوە بیانگوێزێتەوە بۆ جێگایەکی‌تر، وەئەم بایە ناتوانێ لەخۆیەوە هەڵبکات و بێت کەڵك یان زیان بە مەردم بگەیەنێ، ئەبێ هەندێ هۆی تر هەبێ کە ئەم شتانە جێبەجێ ئەکات، وە هەروەها مرۆڤ ئەبینێ مانگ و خۆر و ئەستێرەکان شوێنکەوتووی یاساو رژێمێکی تایبەتین کە ناتوانن بە موو لێی لابدەن.. ئا لێرەدا مرۆڤ بیر لەوە دەکاتەوە کە ئەم شتانەی لەبەر چاون، هەموویان هێزێکی شاراوە هەیە پاڵیان پێوە ئەنێ و بەشێوەیە ئەیان خاتە کارکردن.

ئینجا لە مێشکی‌دا بڕوا بەچەند پەرستراوێکی شاراوەو جیاواز پەیدا ئەکا، بۆیە وا ئەزانێ کە رووناکی و هەواو ئاوو نەخۆشی و جوانی و ناشیرینی ئەمانە هەریەکە پەرستراوێکی تایبەتیان هەیە، وەلە مێشکی خۆیدا جیاوازیەکی بۆ

دروست ئەکاتو دەست ئەکات بە کڕنووش بۆ بردنی.

وە دوای ئەوە کە رووناکی زانیاری پەرەئەسێنیو زیاتر تێئەگا کە لەم جیهانەدا یاسایەکی بەردەوامو ڕێکوپێک هەیە، وە تێئەگا چۆن با هەڵئەکاو باران ئەبارێ وە چۆن ئەستێرە گەرۆکەکان گەڕانی خۆیان لە ئاسمانا دەست پێئەکەنو هەموو کەشێ (فصل) لەکاتی خۆیدا دێتو بەروبوومو کشتوکاڵ پێئەگا بەپێی یاسایەکی دامەزراوو نەگۆڕراو، وە تێئەگا کە ئەم هەموو هێزانە چۆن ئەبن بەیەکو یارمەتی یەکتر ئەدەن لەم یاسایەدا، وەتێئەگا کە هەموو شتێ لەم بوونەوەردا بەستراوە بەکاتو جێگای تایبەتی خۆیەوە، وەلەو کاتەدا هەموو هۆیەکان کۆئەبنەوەو یارمەتی یەکتر ئەدەن، بێدواکەوتنی هیچ کامیان.

وە بەهۆی ئەم بیرکردنەوەو تێگەیشتنی ئەم یاسا بەهێزو نەگۆڕاوەوە مرۆڤی بتپەرست ناچار دان بەوەدا ئەنێ کە ئەم بوونەوەرە پەرستراوێکی هەیە لە هەموو پەرستراوەکان گەورەترو هەموویان فەرمانی ئەو جێبەجێ ئەکەنو لەفەرمانی دەرناچن، چونکە ئەگەر پەرستراوەکان جیاواز بنو هەریەکەیان سەربەخۆ ئیش بکاتو بجوڵێتەوە ئەو کاتە یاسای ئەم بوونەوەرە تێک ئەچێو خراپەو ناڕێکی و ئاژاوە بڵاوئەبێتەوە.

وە پەرستراوە گەورەکە ناو ئەنێ (الله) یا (بریشور) یا (خدای خدایکان) واتە خوای هەموو خوایەکان، وە بچوکەکان لە پەرستنا بەشدار ئەکا یان ئەیان کات بە هاوەڵی ئەو وە خۆی وا تێئەگەیەنێ کە خوایەتیش وەکو پاشایەتی وایە، هەرچۆنێ (پاشا) هەندێ وەزیرو فەرمانبەر بۆ خۆی دیاری ئەکا بۆ ئەوەی پرسو رایان پێبکاو یارمەتی بدەن لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتدا، هەوەرها ئەم خوا گەورەیەش پێویستی بەیارمەتی خوا بچوکەکان هەیە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئەم بوونەوەرە، کەواتە مرۆڤ ناتوانێ لە خوای گەورە نزیک ببێتەوە تەنها بەوە نەبێ کە پەرستراوە بچوکەکان لە خۆی رازی بکات و ئەوانیش بپەرستێو کڕنووشیان بۆ بەرێ، وەخۆی بپارێزێ لەوەی کە لێی تورەبنو قاری لێبگرن، بەم شێوەیە ئەیانکات بەهۆی نزیک بوونەوەی خۆی لە خوای

گەورەوە، بۆیە دەستیان بۆ پان ئەکاتەوەو داوای کۆمەك و یارمەتیان لێ ئەکا، وە هەوڵ ئەدا کە ئەوانیش لەخۆی رازی بکات و قوربانی و شتی وایان بۆ سەرببڕێت.

بەڵام لە کاتێکا کە پلەی زانیاری مرۆڤ بەرزتر ئەبێتەوەو تێگەیشتنی بەهێزتر ئەبێ، ژمارەی خواکانی وردە وردە لەلا کەم ئەبێتەوە، بیرئەکاتەوە لەو هەموو پەرستراوانەی کە نەفامەکان بڕیاریان داون، یەکەیەکە هەموویانی لەبەرچاو ئەکەوێ و ئەزانێ ئەمانە ئەگەر لە مرۆڤ کەمتر نەبن زیاتر نین، لەبەر ئەوە یەکەیەکە وازیان لێ ئەهێنێ و خۆی لە پەرستنیان ئەکێشێتەوە، و ئیتر تەنها یەکێکیان بەڕاست ئەزانێ و بڕوای پێ ئەکا، بەڵام هێشتا هەندێ نەفامی و نەزانین لە ناسینی ئەم تاقە پەرستراوەدا هەر ئەمێنێتەوە.

هەندێ لایان وایە کە ئەویش وەکو ئێمە لەشی هەیە و لە جێگایەکدا بۆخۆی دانیشتووە و تەماشای مەردم ئەکات بزانێ چۆن ئەیپەرستن و وە کڕنووشی بۆ ئەبەن.. هەندێ لایان وایە کە ئەویش هاوسەرو منداڵی هەیە و وەکو ئادەمیزاد نەوەی لێ ئەکەوێتەوە.. هی وا هەیە وا ئەزانێ کە خوا هاتوەتە سەر زەوی و لە شێوەی مرۆڤێکدایە، وە مرۆڤی وایش هەیە لای وایە کە خوای گەورە دوای دروستکردنی ئەم بوونەوەرە ئیتر وازی لێ هێناوەو بەرەڵڵای کردووەو بە هیچ شێوەیە مافی بەسەریەوە نەماوە، و بۆخۆی لە جێگایەکدا دانیشتوەو ئارامی گرتووە.. وە هەندێك لایان وایە کە پێویستە مەردم خواناس و دۆستەکانی خوا بکەن بە تکاکارو هۆی بە خوا گەیشتنیان بۆئەوەی تکایان بۆ بکەن و تاوان و خراپەیان بکرێ بە خاتری ئەوان، وەهی واهەیە لە مێشکی خۆیا وێنەیەکی بۆ خوا بڕیار داوە کە پێویستە لەکاتی پەرستندا ئەو وێنەیە لەبەردەمی خۆیا دابنێ. بەم شێوەیە لە دڵ و مێشکی مەردمدا گەلێ شتی گۆترەکاری و درۆ و هەڵبەستراو بڕیار ئەدرێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مەردمانەش بڕوایان بە یەکێتی خوای پەروەردگار هەیە، بۆیە ئەبینی لەناو قوڕو لیتاوی بتپەرستیدا ئەتلێنەوە، ئەمەش بەرهەمی نەفامی و نەزانینی خۆیانە.

دواترین‌و بەرزترینی ئەم پلەو قادرمانەش بریتی‌یە لە پلەی (لا الـه الا الله)، تەنها ئەوە جوانترین روونـاکی‌و راستترین زانـین، کە خـوای گـەورە لەبـەر ئـەوە پێغەمبەرانی یەك لەدوای یەك ناردووە، لە هەموو ناوچەیەك‌و لەگشت کات‌و چەرخێکدا، هەر ئەویش بووە کەلەسەرەتاوە بۆ (ئادەم) پێغەمبەر نێرراوە، هـەر ئـەم بووە کە نێرراوە بـۆ (نـوح‌و ئیـبراهیم‌و موسـی)‌و پێغەمبـەرەکانی تـر، وە پێغەمبـەرمان محمـد ﷺ کەلـەدوای هـەموویان هـاتووە ئـەویش هێناویـەتی‌و بەندەکانی بۆ بانگ کردووە، تەنها هەر ئەمەیە ئەو زانین‌و تێگەیشتنە پاك‌و بێگەردە، کە هیچ بوونێکی نەفامی‌و نەزانینی تێکەڵاو نی‌یە، وە مەردمیش بۆیە بەو شێوەیە کە وتمان هەمیشە کەوتوونەتە ناو شێوەیە لە شێوەکانی (کفر)‌و بتپەرستی‌یەوە، چونکە لە ئامۆژگاری پێغەمبەران لایان داوەو ویستوویانە بە گۆترەکـاری خۆیـان رێگـای راسـت بدۆزنـەوەو بەسـەریا بـڕۆن، وە ئـەم بـەندە سـەرەڕای کورتـی خـۆی پڕیـەتی لە مانـاو مەبەسـتی گـەورەو مـەزن، بـا ئێسـتا بگەڕێینەوە سەری‌و بە شێوەیەکی جوانتر روونی بکەینەوە:

١. ئەو شـتەی کـە زۆر گرنـگ بـێ بریتی‌یـە لـە (خوایـەتی)، چونکـە ئـەم بوونەوەرە مەزنە کە عەقڵ‌و ژیریـی مـرۆڤ لـە بەرێوەبردنیا سەرسامەو نازانـێ سەرەتاو کۆتاییەکەی کامەیـە، وە ئـەم جیهانـە سـەرەڕای دروسـتکراوی خـۆی هەمیشـە دروسـتکردنی تێدایـە‌و بەردەوامـە، ئـەم جیهانـەی کـە هـەموو رۆژێ رووداوو دۆزراوەی تێدا تازە ئەبێتەوە، بە شێوەیە کە ژیریـی مرۆڤـی سەرسام کردووە، ئەم جیهانە بەم شێوەیە بێگومان پێویستە خوایەکی ئەوتۆی ببـێ کە زینـدوو بـێ‌و نـەمان روی تێ‌نـەکا، وە ئـەبێ پێویسـتی بـە هیـچ شـتێ نـەبێ‌و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکا هەبێ، زانایەکی ئەوتۆ بێ هەرگیز هەڵە نەکات، و هیچی لـێ شاراوە نەبێ، و کەس نەتوانێ بەرگری ئەمرو فەرمانەکانی بکات، و خاوەنی هەموو هێزێ بێ و هەموو شتێ لەوەوە هۆی ژیان وەربگرێ، جێگای ناتـەواوی‌و کـەم‌وکوڕی نـەبێ و هیـچ کەسـێ نـەتوانێ دەسـت بخاتـە ئیش‌وکاریەوە.

٢. وه پێویسته ئاوه‌ڵناوه‌كانی خوایه‌تی (صفات الألوهیة) هه‌موویان له‌یه‌ك كه‌سدا كۆببنه‌وه‌، وه‌هه‌رگیز ناگونجێ دووكه‌س ئه‌م ئاوه‌ڵناوه‌یان به‌یه‌كسانی تێدابێ، چونكه ئه‌وه‌ی كه ده‌سه‌ڵاتی به‌سه‌ر هه‌موو كه‌سێكا ببێ‌و فه‌رمانڕه‌وای هه‌موی بێ ناگونجێ له‌یه‌ك كه‌س زیاتر بێ، وه شتێكی نه‌گونجاوه‌و زۆر له راستیه‌وه دووره كه ئاوه‌ڵناوه‌كان دابه‌ش بكرێن به‌سه‌ر چه‌ند په‌رستراوێكی جیاجیادا، چونكه ئه‌گه‌ر یه‌كێكیان فه‌رمانبه‌ربێ‌و ئه‌ویتریان زانا بێ و یه‌كێكی‌تریان رۆزی به‌ده‌ست بێ، یارمه‌تی یه‌كتریش نه‌ده‌ن، بێگومان جیهان كاول ئه‌بێ‌و به‌جارێ له‌ناو ئه‌چێ، هه‌روه‌ها ناگونجێ ئه‌م ئاوه‌ڵناوانه بگوازێته‌وه له یه‌كێكیانه‌وه بۆ یه‌كێكی‌تریان، واته جارێك ئه‌مه‌یان په‌رستراو بێ‌و جارێكی‌تر ئه‌وی تریان، چونكه ئه‌وه‌یان كه ناتوانێ ئاوه‌ڵناوێ بۆ خۆی بهێڵێته‌وه و پارێزگاری بكات ئه‌ی چۆن ئه‌توانێ ببه‌خشێ به‌ویتریان، وه ئه‌وه‌یان كه ناتوانێ له خۆیا خوایه‌تی بهێڵێته‌وه ئه‌ی چۆن ئه‌توانێ كاروباری ئه‌م بوونه‌وه‌ره ببا به‌ڕێوه؟! به‌ڕاستی مرۆڤ هه‌رچه‌ند رووناكی‌و زانیاری زیاتر بێ بڕوای پته‌وتر ئه‌بێ به‌وه كه پێویسته هه‌رچی ئاوه‌ڵناوه‌كانی خوایه‌تی هه‌یه هه‌موویان له‌یه‌ك كه‌سدا كۆببنه‌وه.

٣. كاتێ به‌م شێوه گشتی‌یه له خوایه‌تی تێگه‌یشتی‌و كه‌مێكیش له‌م بوونه‌وه‌ره ورد بوویته‌وه، بۆت ده‌رئه‌كه‌وێ ئه‌وانه‌ی كه ئه‌بینی‌و به‌یه‌كێ له هۆیه‌كانی زانین هه‌ستی پێ‌ئه‌كه‌ی، هیچیان ئه‌م ئاوه‌ڵناوه‌یان تێدا نی‌یه، وه هه‌رچی له‌م بوونه‌وه‌ره‌ردا هه‌یه هه‌مووی پێویستی به شتێكی‌تر هه‌یه ئه‌ژی‌و ئه‌مرێ. چاك ئه‌بێ‌و خراپ ئه‌بێ، وه له‌سه‌ر یه‌ك بار راناوه‌ستێ، وه هه‌رگیز ناتوانێ له خۆیه‌وه ئیشێ بكات به‌و شێوه‌یه كه خۆی ئه‌یه‌وێ، وه ناتوانێ له‌و یاسایه‌ی بۆی دانراوه بچێته ده‌ره‌وه، وه ته‌نها ئه‌مه به زمانی حاڵ شایه‌تی ئه‌دا كه هیچ شتێ له‌م بوونه‌وه‌ره‌دا شایانی په‌رستن نی‌یه، وه به‌هیچ شێوه‌یه نه كه‌م‌و نه زۆر خوایه‌تی تێدا نی‌یه، ئا ئه‌مه‌یه مانای (لا اله).

٤. ئینجا كه خوایه‌تیمان له هه‌موو شتێك . گه‌وره یا بچووك . داڕنی‌و

لێمـان سـەندەوە، ئـەبێ دان بـەوەدا بنێـین کـە یـەکێ هەیـە لەسـەروی هـەموو شتێکەوە، وە هیچ شتێ ئاوەڵناوی خوایەتی تێدا کۆنەبوەتەوە ئەو یەکە نەبێ، ئا ئەمەیە ماناو مەبەستی رستەی (لا اله الا الله).

تەنها ئەمەیـە گـەورەترین زانـین و تێگەیشتنی تـەواو، وە هـەتا لـە زانیـاری و لێکۆڵینەوەدا پێش بکەوی باشتر ئەزانی کە تەنها ئەمەیە سەرەتای زانین و هـەر ئەمەیشە کۆتاییەکەی، وە هەر کاتێ زانیاری‌یەکانی وێنەی (طبيعيات و كيميا و هيئة و أرضيات و حياتيات و حيوانيات و انسانيات) جوان تێگەیشتی و لـە ناویاندا قووڵ چوویتە خوارەوە، ئینجا بڕواو تێگەیشتنت زیاد ئـەبێ بـەوە کـە لـەم بوونـەوەرەدا پەرسـتراو نی‌یـە خوانـەبێ، وە لـە هـەموو هـەنگاوێ لـە هـەنگاوەکانی زانیـاری بۆت دەرئەکەوێ کە هـەموو شـتێ بێ‌مانـاو بـێ سـوود ئەبێ، ئەگەر ئەم راستی‌یە ون بکرێ و بڕوای پێ نەهێنرێ.

## کاری بڕوای خوا بەیەك زانین لە ژیانی مرۆڤدا

ئەمەو فەرموو با ئێستا باسی ئەوە بکەین کە خوا بەیـەك زانـین چ کـارێکی گەورەی هەیە لە ژیانی مرۆڤدا وە بۆچی رسوایی و زەرەرمـەندیی کـاڵای بـاڵای ئەو کەسەیە کە بڕوای بەم رستەیە نەبێ.

١. ئەو کەسەی کە بڕوای بەم رستەیە ببێ هەرگیز ناگونجێ کە بیروڕایەکی تەسـك و تروسـکی هـەبێ، چونکـە بـڕوای هەیـە بـەو کەسـەی کـە ئـەم زەوی و ئاسمانانـەی دروسـتکردووە، وە رۆژهـەڵات و رۆژئـاوا هەمووی لـە ژێـر دەسـتی توانـای ئەودایـە، خـوای هـەموو جیـهان و جیهانیانـەو تەنـها ئـەو رزق و رۆزییـان ئەداو بەخێویان ئەکا، ئیتر دوای ئەم بڕوایە لە هیچ شتێك سـەر ناکاتـەوەو لێـی سەرسـام نابـێ، چونکـە ئـەزانێ هـەموو شـتێك لـەم جیهانـەدا ژێردەسـتی خاوەنەکەیـەتی کـە خـوای پـەروەردگارە، وە هیـچ شـتێ نی‌یـە کـە بتوانـێ بەرامبـەری لەگـەڵ بکـات و دژی رابوەسـتێ، یـا بتوانـێ هەسـتی بـەزەیی و خۆشەویستی لـێ قەدەغە بکـات، بـەم پێیە ئـەم مرۆڤـە بیرێکی بـەربڵاوی هەیـە

بەپێی گەورەیی و بەربڵاوی ئەم جیهانە کە دەستکردی خوای گەورەیە، وە ئەمە شتێکە نایەتە دی بۆ کەسێ کە بڕوای بە خوا نەبێ، یان بڕوای بەچەند خوایەك هەبێ، وە یا ئاوەڵناوی کەمو کوڕی مرۆڤ بۆ خوای گەورە بڕیار بدا.

٢. بڕواکردن بەم رستەیە ئازادیو سەربەستیەکی بێوێنە لە دڵی مرۆڤدا ئەڕوێنێ، چونکە ئەزانێ هەموو شتێكو هەموو هێزێك لەم بوونەوەرەدا بەدەست خوای پەروەردگارەوەیەو خاوەنی راستەقینەیان تەنها ئەوەو بەس، وە ئەزانێ تەنها ئەو خوایەیە کە ئەتوانێ سودو زیان بە مەردم بگەیەنی وە ژیانو مردن بەدەست ئەوە، کەس خاوەنی فەرمانو دەسەڵاتو گەورەیی نی یە ئەونەبێ، بەم شێوەیە ئەم بڕواو زانینە گەورەیە، وای لێ ئەکات کە پێویستی بە هیچ شتێ جگە لە خوا نامێنێ، وە لە هەموو شتێك خۆی بەدەوڵەمەند ئەزانێ، ئەوەی پێی بڵێی ترسو لەرز لە دڵیا نامێنێ، بەم هۆیەوە سەر بۆ هیچ دروستکراوێ دانانەوێنێ و بچوکی ناکێشێ، و هێزو دەسەڵاتی هیچ دروستکراوێ نایترسێنێ، بێگومان ئەم جۆرە خوڕەوشتە بەرزانە تەنها لە مرۆڤێکا چاوەڕوان ئەکرێ کە بڕوای بە خوای گەورە ببێ بەو شێوەیە کە (لا اله الا الله) داوای ئەکات، بەڵام ئەو کەسەی کە بتپەرست بێ وە خوانەناس (کافر) بێ لە زۆر شت ئەترسێو ملی بۆ کەچ ئەکات، وە وائەزانێ کە سودو قازانجو بەختیاری ئەو بەدەم رەشەباوەیەو هەر ئەوەندەت زانی هاتو توشی گیروگرفتی کرد، چونکە لە هەموو شتێكو لە هەموو هێزێك ئەترسێو لێی ئەپاڕێتەوە وەبچوکیو ریایی بۆ ئەکات وە هیواو ئاواتی خۆی بەگەلێ شتەوە بەستووە.

٣. لەگەڵ ئەم هەموو ئازادیو سەربەستیە کەلە دڵی مرۆڤدا دروستی کردووە، مرۆڤی خاوەن بڕوا هەمیشە خۆی بە بچوك دائەنێ و کەشو فشی نی یە وە خۆی بە زل ناگرێ بەسەر مەردما، چونکە ئەو کەسەی کە بڵێ (لا اله الا الله) ئیتر شەیتان ناتوانێ فوو بکا بە لوتیاو لوتی پێ بەرز بکاتەوە، و دڵی پڕبکا لە لەخۆبایی بوون و خۆڵی گۆڕان، چونکە بەجوانی ئەزانێو بڕوای

کردووه که ئەو شتەی جێگای شانازیە بەخشندەی خوای گەورەیە، هەموو کاتێ ئەتوانێ لێی بسێنێتەوە.. بەڵام مرۆڤی بێبرواو بتپەرست هەمیشە خۆی بەزل ئەگرێو فیز بەسەر مەردما ئەکات، جاری وایش هەیە بێئەوەی هۆیەکی وای تێدا بێت کە شایانی شانازی بێ تەنها ئەیەوێ ناتەواوی خۆی بەم فیزو لووت بەرزیە پڕبکاتەوە، وە لەکاتێکا کە شتێکی دەست دەکەوێ یان کەمێ زانیاری یان ئازایەتی هەیە، ئیتر خۆ لەو کاتەدا بەتەواوی لوت بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمانو لافی خوایەتی لێ ئەدا، وا ئەزانێ ئەم زەویە بەتایبەتی بۆ ئەوەو کەسی تر شایانی ژیانو مانەوەی نییە، چونکە بڕوای وایە کە سەرچاوەی ئەم زیرەکیو ئازاییو ماڵو سامانە تەنها خۆیەتیو بەس، بۆیە بەم شێوەیە لەخۆی بایی ئەبێو خۆی لە مەردم جیا ئەکاتەوە، لەوانەیە ئەگەر بۆی دەست بدا داوای خوایەتی ئەکاو ئەیەوێ هەموو کەس بەگوێی ئەو بکاو بجوڵێتەوە، بەم جۆرە ئەبێتە میکرۆبی ئاژاوەو تێکدانی ناوچەیە، وە ئەم خووە خراپە لە خۆیا ڕاناوەستێو بەس، بەڵکو وەکو نەخۆشی (درم) بڵاوئەبێتەوەو گەلێ کەسی تریش تووشی ئەم نەخۆشیە ئەبێت تاوای لێدێت چەند ناوچەو وڵاتێکیتر ئەگرێتەوەو ئاژاوەو ناکۆکی تێدا بەرپا ئەبێ، ئەمەش هەمووی لە پێناوی لوت بەرزیی کابرایەکی خوانەناسدا.

٤. ئەو کەسەی کە بڕوای بەم ڕستەیە هەیە زۆر چاك ئەزانێ و تێگەیشتووە کە ڕێگا نییە بۆرزگاریو بەختیاری خۆی تەنها ئەوە نەبێ کە چاکە بکات وە هەوڵێکی باشو بێووچان بدا بۆ پاککردنەوەی دەروونی خۆی، وە هەمیشە کردەوەی چاکی لێ ئەوەشێتەوە، بە شێوەیە ئەگەر لە ڕێکەوتێکا ئازاری بە مێرولەیەك گەیاند لە دڵی خۆیدا دادگایەکی زۆر چاك بۆخۆی ئەگرێو فەرمان ئەدا بە سەر خۆیدا و ئیتر جارێکیتر شتی لەم وێنەیە لە دەستی ڕوونادات. وە هەمیشە وەکو بلور پاكو بێگەردە، هەرکاتێ لەکەیەکی لێ بنیشێ زۆر چاك دیارەو بە زووترین کات پاکی دەکاتەوە و خۆی لەو لەکەیە ڕزگار ئەکات، بڕوای بە خوایەکی ئەوتۆ هەیە کە خزمی کەس نییەو لەکەس

ناترسیو بەرتیلو زمان لووسی و شتی وا کاری تێناکات. بەڵام خوانەناسو بتپەرستەکان هەموو ژیانی خۆیان بە هیوای پڕوپووچ و درۆ ئەبەنە سەرو تەواوی ئەکەن، هەندێکیان وایان داناوە کە پێغەمبەرەکەیان کوڕی خوایەو لەبەر ئەوە ئەکرێن بەخاتری ئەو و چاوپۆشی لە تاوانەکانیان ئەکرێ، هەندێکیش ئەڵێن: ئێمە کوڕی خواینو خۆشەویستی ئەوین، لەبەر ئەوە لە گوناهەکانمان ئەبورێ وە ئازارمان نادات، هەندێ تریش ئەڵێن: ئێمە لە رۆژی دواییدا پیاوە گەورە خواناسەکانمان ئەکەین بە تکاکار لای خوا بۆ ئەوەی بمانپەڕێننەوە و تووشی ئازار نەبین، هەندێکی تریش قوربانیو شتی وا ئەکەن بۆ خواکانیان بۆئەوەی ئازادو سەربەست بنو چی ئارەزوویان بێ بیکەن. بەم شێوەیە ئەم باوەڕە بۆگەنو پڕوپووچانە وایان لێ ئەکا کە هەمیشە بەناو چڵكو چەپەڵی تاوانو تاوانباریدا ئەتلێنەوە، و بەهیچ جۆرێ پارێزگاری خۆیان ناکەن و لە هیچ تاوانێ خۆیان ناگێڕنەوە، چونکە ئەم باوەڕە ناپەسەندانە وای لێکردوون گوێ نادەنە پاککردنەوەی دڵو دەروونی خۆیانو چاککردنی کردەوەکانیان، خۆ ئەو کەسەی کە بە هیچ شێوەیە بڕوای بەخوا نەبێ، هەرگیز بە بیریا نایە کە لەسەر کردەوەکانی لێپرسینەوە هەیە، جا ئەگەر چاك بوو پاداشتی چاکەیەو ئەگەر خراپ بوو تۆڵەی خراپەیە، لەبەر ئەوە بەرەڵڵایەو خۆی نابەستێ بە هیچ یاساو رژێمێکەوە جگە یاساو رژێمی ئارەزووی خۆی، بەڵام بۆ ئەم یاسایە بەندەیەکی گوێڕایەڵەو بە هیچ شێوەیە سەرپێچی لە فەرمانی ئاغای خۆی ناکات.

٥. ئەو کەسەی کە ئەم رستەیە ئەڵێ هەرگیز بێهیوایی رووی تێناکا، چونکە بڕوای وایە کە هەرچی گەنجینەو بەخشندە هەیە هەمووی بەدەست خوایە، و گەنجینەو بەخشندەی ئەویش تەواو نابنو لە ژمارەدا نین، بەم جۆرە ئەم بڕوایە خۆشی ئەخاتە ناو دڵو دەروونییەوەو گیانی پڕ ئەکات لە ئارامو لەسەرخۆییو هیواو ئاوات، لەو کاتەیشدا کە تووشی گەورەترینو سەختترین گیروگرفت بووبێ و هەموو رێگاو دەرگاکانی ژیانی لێ بەسرابێ، چونکە زۆر

چاك ئەزانێ کە خوای گەورە ئاگای لێیەتی و پارێزگاری ئەکات بەشێوەیە کە نایداتە دەستی خۆیشی، لەبەر ئەوە هەمیشە لە تێکۆشاندایەو هەوڵی یەك لەدوای یەك ئەدا بە پشتیوانی و چاودێری خوای پەروەردگار، و یارمەتی و کۆمەکی لێ داوا ئەکات، جا ئەم دڵخۆشی و ئارامی گیان و دەروونە تەنها لە بڕوای (خوا بەیەك زانین)دایە، بەڵام کافرەکان و بتپەرست و بێبڕواکان چونکە پاڵیان بەچەند هێزێکی کەم و کورتەوە داوە بە زووترین کات بێهیوایی و بێئارامی روویان تێئەکات و هیواو ئاواتیان ئەبڕێتەوەو نامێنێ، ئەبینی گەلێ جار ناچار خۆیان ئەسوتێنن، وەیا خۆیان ئەکوژن بۆ ئەوەی لە دەست ئەو بێهیوایی و بێئارامییە رزگار بێن.

٦. هەروەها بڕواکردن بەم رستەیە مرۆڤ پەروەردە ئەکا لەسەر هێزێکی گەورە کە پێك هاتبێ لە تواناو ئازایەتی و پەلاماردان و ئارام و خۆڕاگرتن، چونکە لە کاتێکا بە ئیش وکارە گرنگەکانەوە خەریکەو تەنها پێخۆشبوونی خوای گەورەی مەبەستە، لەم کاتەدا زۆر باش تێئەگا و ئەزانێ ئەو هێزەی کە ئەم زەوی و ئاسمانانەی راگیرکردووە لەگەڵ ئەودایەو چاودێری و ئاگاداری ئەکات لە هەموو قۆناغێکا، لەبەر ئەوە خۆگرتن و ئارام و ئازایەتیەکی تیا ئەڕوێ کەلە شاخەکان بەهێزترو بتەوتربێ، بۆیە هیچ گیروگرفتێ لە گیروگرفتەکانی جیهان و هیچ هێزێ لەو هێزانەی کە پێچەوانەی ئەون نای پسێنێ و نای بەزێنێ و ناتوانێ دایبمرکێنێ و لەوەی کە بڕوای پێهێناوە جیای بکاتەوەو دوای بخات، بەڵام بێبڕواو بێئایین و بتپەرستەکان هەرگیز لەم پلەیەدا نین لە هێزو ئارام و خۆڕاگرتندا.

٧. ئەم ڕستەیە دڵی مرۆڤ پڕ ئەکا لە ئازایی و چاونەترسان، چونکە ئەوەی کە مرۆڤ ترسنۆك ئەکات و لە کارکردن دای ئەمرکێنێ تەنها دوو شتە: یەکەمیان بریتییە لە خۆشەویستی گیان و سامان و ماڵ ومناڵ و کەس وکار، دووەمیان ئەو بڕوایەیە کەپێی ئەڵێ جگە لەخوا یەکێکی تر ئەتوانێ بتمرێنێ، وەیا خۆی ئەتوانێ مردن بگێڕێتەوە، خۆ بڕوای مرۆڤ بە (لا الە الا اللە) ئەم

دوو هۆیه له دڵا ئەسڕێتەوەو لایان ئەبا، و له چڵك و چەپەڵیان پاکی ئەکاتەوە، یەکەمیان بەوە ئەسڕێتەوە کە بڕوای پێ پەیدا ئەکا کە خاوەنی گیان و ماڵ و منال تەنها خوای پەروەردگارە، لەبەر ئەوەیە ئامادەیە کە هەموو شتێ . گران یا هەرزان . بکات بە قوربانی لە پێناوی پێخۆشبوونی ئەودا. دووەمیش بەوە ئەسڕێتەوە کە ئەیخاتە دڵ و دەروونیەوە کە نەتۆپ و نەقونبولە، نە خەنجەرو نەدار نە مرۆڤ و نە زیندەوەر، هیچ شتێ لەمانە ناتوانێ ژیانی لێ بسێنێتەوە، وە خوای پەروەردگار کاتێکی داناوە بۆ مردنی، کە هەرچی هێزهەیە لە بوونەوەردا ناتوانێ پێشی بخات و لە جێگای دیاریکراوی خۆی بیگوازێتەوە، لەبەر ئەوە ئەبینی لە هەموو کەس بە ورەو ئازاو بەجەرگترە، بۆیە سوپای بەهێزو گوللەباران و بۆمبای ناپاڵم نایترسێنن و کۆڵی پێنادەن و لە تێکۆشانی رێگای خوا ناتوانن دووری بخەنەوە، وە هێزێ کە دە ئەوەندەی هێزی خۆیەتی ئەی شکێنێ و لەناوی ئەبا، ئایا ئەم جۆرە هێزەکەی لە بتپەرست و خوانەناس و بێبڕوادا هەیە، ئەوانەی خۆیان لە هەموو شتێ لا خۆشەویست ترەو وا ئەزانن کە مردن تەواوبوونی هیوایانەو ئیتر ترووسکەی ژیانیان ئەکوژێتەوە، وەئەم مردنەیشیان بەسەر نوکی خەنجەری دوژمنەوەیە؟!

٨. بڕواکردن بە دروشمی (لا الە الا الله) رێزی مرۆڤ بەرز ئەکاتەوەو ئاوەڵناوی بڵندی و دڵنیایی تێدا پەیدا ئەکات، وە دڵ و دەروونی پاك ئەکاتەوە لە چڵك و چەپەڵی پیسکەیی و چڵێسی و نزمی و بێئابڕویی و هتد.، و هەرگیز بۆ سەرکەوتنی خۆی رێگای نالەبارو ناپەسەند ناگرێتەبەر، چونکە بڕوای هەیە کە سەرکەوتن و ناوبانگ و رزق و رۆزی و دەسەڵات و ئەم جۆرە شتانە هەموو بەدەست خوایە، ئەیدا بەهەرکەسێ کە شایەنیەتی بە گوێرەی ئەو (حیکمەتەی) کە خۆی ئەیزانێ، وە مرۆڤ هەرئەوەندەی لەسەرە کە هەوڵ و کۆششی خۆی بخاتە کار لە رێگای دروست و پەسەندەوە. وە سەرکەوتن و زیان تەنها بەدەست خوایەو بەس، هەرچی خوا بیدا کەس ناتوانێ بیگێڕێتەوە، وە هەرچیش قەدەغە بکا لە یەکێ کەس ناتوانێ پێی بگەیەنێ، بەلام خوانەناس و

بێبڕواو بتپەرستەکان، سەرکەوتن و زیان هەر لە خۆیاندا ئەبینن، لایان وایە ئەگەر هێزە دنیاییەکان ڕێك بوون لەگەڵیاندا ئەوە سەرکەوتوون و ئەگەر ناڕێك بوون ئەوە ئاواتیان نەهاتۆتە دی، لەبەر ئەوە بوون بەبەندەی چڵێسی و ئارەزووی خۆیان و لە پێناوی سەرکەوتنێکی سادەی خۆیاندا لەبەرتیل و روپامانی و هەموو هۆیەکی نزم و ناپەسەند خۆیان ناگێڕنەوە، وە هەمیشە خەشم و رقیان لەو کەسانە هەڵئەسێ کە خوا بەخشندەی پێداوون، بە شێوەیە هەمیشە دڵیان ئاگری تێدایەو ئەسووتێ، و لەڕقا سەرپەنجەی خۆیان ئەگەزن، و چەندەها پیلان و فێڵ و تەڵەکە ڕێك ئەخەن لە پێناوی لەناوبردنی ئەوانەی کەوا خۆشیان ناوێن.

٩. گرنگترین شتێ کە لێرەدا شایانی باس بێ ئەوەیە کە ئەم بڕوایە مرۆڤ بەیاساو دەستوری خواوە ئەبەستێتەوەو هەمیشە لەپارێزگاری ئەو یاساو دەستورەدایە، چونکە بە هۆی ئەم بڕوایەوە ئەزانی کە خوای پەروەردگار ئاگای لە هەموو شتێکەو لە ڕەگی بناگوێی نزیکترە، و ئەزانێ ئەگەر لە تاریکی شەوداو لە کاتی تەنیاییدا هەر شتێك بکات خوا پێی ئەزانێت و ئەیبینێ، تەنانەت ئەگەر نیازی خراپ بە دڵیا بێت ئەویشی ئاگا لێیەو پێی ئەزانی، چونکە زانینی خوا هەموو شتێکی گرتوەتەوە لە هەموو کات و شوێنێکدا، وە ئەزانێ ئەگەر لەوانەبێ لە شتێکا مەردم پێی نەزانێ خوا هەرپێی ئەزانێ، وە ئەگەر بتوانێ لەمەردمی بشارێتەوە لە خوای چۆن ئەشارێتەوە، وە ئەگەر بتوانێ لەدەست بەندەکانی خوا حۆی دەرباز بکا ئەی لەدەست هێزو دەسەڵاتی خوا چۆن دەرباز دەبێت، هەروا بەم شێوەیە هەتا بڕوای بەخوا بەهێزتر بێ خۆی لە خراپە ئەگێڕێتەوەو باشتر ئەچێتە پێشەوە بۆ کردەوەی باش و بەسوود نەك بۆئەوەی کە مەردم خۆشیان بوێ و سوپاسی بکەن، بەڵکو تەنها بۆئەوەی کە خوای پێی خۆشەو پێخۆشبوونی ئەوی دەستبکەوێ، وە زۆر باش ئەزانێ ئەگەر لە شەوێکی تاریکا یا لە جێگایەکی چۆڵ و تەنیادا بێ، هەمیشە چاودێرێکی لەگەڵدایە کە بەهیچ شێوەیەك لێی جیانابێتەوەو لێی بێئاگا نابێ،

وه هەمیشە وێنەی ئەو دادگا گەورەیەی لە پێش چاوە کەکەس ناتوانێ خۆی لێ بشارێتەوە، یان بەخاترانەو بەرتیل‌و شتی‌وا خۆی رزگار بکات، لەبەر ئەوەیە کە بڕوا بە (لا اله الا الله) یەکەم مەرجە بۆ ئەوەی مرۆڤ ببێ بە (مسلم) واتە موسوڵمان چونکە مانای موسوڵمان. وەکو لەبەشی یەکەمدا باسمان کرد. ئەو بەندە گوێگرەیە کە هەرگیز لە یاساو فەرمانی خوا ناچێتە دەرەوە، وە هەرگیز ناگونجێ کە مرۆڤ بەندەیەکی گوێگربێ‌و لە فەرمانی خوا دەرنەچێ هەتا لە قوڵایی دڵیەوە بڕوای بەوە نەبێ کەکەس نی‌یە بپەرسترێ خوا نەبێ، کە ئەمەش مانای (لا اله الا الله)یە. وەبڕوا هێنان بە (لا اله الا الله) یەکەم پایەی گرنگ‌و بنچینەییە لە ئامۆژگاری‌و رابەری پێغەمبەرمان محمددا، وە هەر ئەوە سەرچاوەی ئیسلام‌و بنکەی بەهێزی ئەم ئایینە گەورەیە، وە هەرچی بیروباوەڕی ئیسلام‌و فەرمان‌و یاساو رژێمی هەیە هەمووی لەسەر ئەم بنکەیە دانراوەو لەوەوە هێزو راستی وەرئەگرێ، وە قەڵای ئاینی ئیسلام دوای لاچوونی ئەم بنکەو بناغەیە هیچی لە جێگای خۆیا نابێ‌و نامێنێتەوە.

## بڕواکردن بە فریشتەکانی خوا (الإیمان بملائکة الله)

دووەم شت لەوانەی کەپێغەمبەرمان (محمد) ﷺ فەرمانی داوە کەبڕوامان پێیان ببێ. دوای بڕواکردن بەخوای پەروەردگار. بریتی‌یە لەبڕواکردن بەفریشتەکانی خوا، گەورەترین سوودی ئەم بڕوایەش ئەوەیە کە خوا بەیەك ناسینەکەمان بەتەواوی پاك ئەبێتەوە لە بۆنی بتپەرستی‌و هەموو چڵك‌و چەپەڵیەکانی.

لە پێشەوە ئەوەمان زانی کە بتپەرستەکان دوو جۆر دروستکراوی خوایان کردووە بە هاوەڵ‌و هاوبەشی خوای پەروەردگار، جۆرێکیان لەو دروستکراوانەن کە ئەبینرێن‌و لەبەرچاون وەك مانگ‌و رۆژو ئەستێرەو ئاوو ئاگرو هەواو پیاوە گەورەو چاکەکانیان...هتد.

بەڵام جۆرەکەی تریان لەو دروستکراوانەن کە نابینرێن‌و لەبەر چاوی مەردم

شـــاراوەن، ئەوانـــەی کـــە لەپشـــتی پـــەردەوە بـــەڕێوەبردنی کاروبـــاری ئـــەم بوونـەوەرەیان پێ‌سـپێرراوە، هـەندێکیان ئـەوەیان پێ‌سـپێرراوە کـە پـاڵ بـە بایەکان(الریاح)ەوە ئەنێن و لە باکورەوە بۆ باشور و لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، وە هـەندێکیان ئـەوەیان دراوەتـە دەسـت کـە پـاڵ بـە هەورەکانـەوە ئـەنێن لـە لایەکەوە بۆ لایەکی‌تر، وە هەندێکیان کاروباری بارانیـان پـێ جێبەجێ‌ئەکرێ و هەندێکیشیان رووناکی و تاریکیان پێ‌ئـەبرێ بـەڕێوە هتـد. ئینجـا جـۆری یەکەم چونکە دیارن و لەبەر چاون هەر کە وتمـان (لا الـه الا الله) واتـە پەرستراو نی‌یە خـوا نـەبێ، زۆر بە روونـی و ئاشـکرا خوایـەتیان لـێ ئەبێتـەوە و ئـەزانین شایانی پەرستن نین، بەڵام جۆری دووەم چونکە شاراوەن و بەچاو نـابینرێن و بتپەرستەکانیش هـەر لەبـەر ئەمـە کـە بـەخوایان ئـەزانن، ئـەوەتا هـەندێکیان ئەپەرستن و هەندێکیشیان بڕیاری ئـەوە ئـەدەن کـە گوایـە کچـی خـوان، بۆیـە هەندێ وێنەیان بۆ دروست ئەکەن و کڕنووشیان بۆ ئەبەن وەیا قوربانی و شتی وایان بۆ ئەکەن.

جا لەبەر ئـەوە ئـایینی ئیسـلام بڕواکـردن بـە فریشـتەی کـرد بـە بڕوایـەکی سـەربەخۆو جیـاواز، بۆئـەوەی بـڕوای خـوا بەیـەکزانین بـە پـاکی و بێگـەردی بمێنێتەوە و هیچ بۆنێکی بتپەرستی لێنەیەت، وە ئەم جۆرە دروستکراوانە، کە هەندێ کەس ئەیانپەرستن وەیا بە کچ و کوڕی خوایـان دائـەنێن، پێغەمبـەرمان محمدﷺ وای باسکردووە بۆمـان کە ئەمانـە فریشـتەی خـوای پـەروەردگارن وە هیـچ پەیوەندیـەکیان بـە خوایـەتی خـواوە نی‌یـە، بـەڵکو فەرمانبـەری خـوان و ناتوانن بە هیچ جۆرێ لە فەرمانی ئەو دەربچن، خوای پەروەردگار کاروباری ئەم بوونەوەرەیان پێ‌ئەبا بەڕێوە، وە ئەوان لە خۆیانەوە زۆریان بەسەر هیچ شتێکدا ناشکێ وە ناتوانن هیچ ڕێگایەك بۆ خوا دابنێـن وەیا تکای کەسێکی ببەنـە لا بەمانای ئەوە کە ئەم کەسە خۆشەویستی خۆیانەو بیانەوێ بیپەڕێننەوە.

ئینجا زۆر نزمی و شورەییە بۆ مرۆڤ کـە ئەمانـە بپەرستێ و داوای کۆمـەك و یارمـەتیان لـێ بکات، نـابینی کاتـێ کـە خـوای گـەورە باوکـە گـەورەمان ئـادەم

پێغەمبەری دروست کرد فەرمانیدا بەمانە کە کڕنووش(سجدة)ی بۆ ببەن، وە زانیاریو تێگەیشتنێکی دا بەئادەم کە نەیداوە بەمان، وە هەروەها لەباتی ئەوان ئادەمیزادی کردووە بە جێنشین لە زەویدا، بۆیە هیچ مانایەکی نییە کە ئادەمیزاد کڕنووش ببا بۆ ئەو فریشتانەی کەلەکاتی خۆیدا کڕنووشیان بۆ بردووە.

پێغەمبەرمان محمد ﷺ لەلایەکەوە قەدەغەی لێکردووین کە فریشتەکان بپەرستینو بیانکەین بە هاوەڵی خوای گەورە، وە لەلایەکیترەوە بۆی باسکردوین کە ئەم فریشتانە دروستکراوو بەندەی خوای پەروەردگارن، و بەجۆرێك دروستی کردوون کە دوورن لە هەڵەو تاوان کردن، وە سروشتی وا بۆ داناون کە هەرگیز لەفەرمانی دەرناچنو بێئەمری ناکەن و هەمیشە لەپەرستنی خوادانو ئەوەندە چاو بنێی بەیەکدا دەست هەڵناگرنو لەپەرستنی ماندوو نابن، وە خوای گەورە یەکێکیانی دیاری کردوە بۆئەوەی پەیامو بەرنامەی پێدا بنێرێ بۆ پێغەمبەران و نێرراوەکانی خۆی کە ئەویش ناوی (جبرئیل)ە، هەر ئەویش بوو کە قورئانی پیرۆزی هێنا بۆ پێغەمبەرمان محمدﷺ، وە هەندێ لەم فریشتانە دانراون بەسەر مەردمەوە ئاگایان لەچاکەو خراپەیان هەیە، قسەی چاكو خراپ هەمووی وەرئەگرنو تۆمار(تسجیل)ی ئەکەن، بۆ کردەوەو وتاری هەموو مرۆڤێك تۆمارێکی تایبەتیان هەیە کەلە رۆژی دواییدا لە دادگای خوادا هەمووی دێننە بەردەستی خاوەنەکەیو پێ نیشانی ئەدەن، وەهەرچی کردبێ لە چاکەو خراپە بە نهێنی یان ئاشکرا هەمووی لەوێ لایەو ئەخرێتە پێش چاوی ئەمەو ئەبێ ئەوەش بزانین کە لە بابەت چۆنیەتیو بنجو بناوانی فریشتەوە ئێمە هیچمان پێ نەوتراوە، تەنها ئەوەمان لەسەرەو پێمان سپێرراوە کە ئەبێ بەم شێوەیە بڕوامان بەبوونیان ببێ، وە هیچ رێگایەکیش نییە بۆ ناسینی شێوەو چۆنیەتیان، لەبەر ئەوە بەشێکە لە نەفامیو نەزانین ئەگەر لە خۆمانەوە چۆنیەتیەکیان بۆ بڕیار بدەین، وە بێئاینیو بێبڕواییشە ئەگەر بڕوامان بە بوونیان نەبێ، چونکە هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە، وە

ئینکاریش لە بوونیاندا بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەری تێدایە.

لە راستیدا ئێمە بۆیە بڕوامان بە فریشتەکانی خوا هەیە چونکە پێغەمبەرمان محمدﷺ فەرمانی داوە کە بڕوامان پێیان ببێ.

## بڕواکردن بە پەڕاوەکانی خوا ( الإيمان بكتب الله )

سێیەم شت لەوانەی کە پێغەمبەرمان محمد ﷺ فەرمانی پێداوین کە بڕوامان پێی ببێ بریتی‌یە لەو پەڕاوانەی کە خوای پەروەردگار ناردوونی بۆ هەموو پێغەمبەران و نێرراوەکانی خۆی.

خوای پەروەردگار هەرچۆنێ قورئانی پیرۆزی ناردووە بۆ پێغەمبەرمان محمدﷺ، هەروەها پەڕاوەکانی تریشی ناردووە بۆ ئەو پێغەمبەرانەی کەلە پێشەوە رەوانەی کردوون، وە ئێمە ناوی هەندێ لەم پەڕاوانەمان پێ‌وتراوە وەکو (صحف) کە بۆ ئیبراهیم پێغەمبەر، و (توراة) کە بۆ موسا پێغەمبەر، و (زبور) بۆ داود پێغەمبەر، و (انجیل) کە بۆ عیسا پێغەمبەر نێرراوە، بەڵام ئەو پەڕاوانەی کە بۆ پێغەمبەرەکانی تر نێرراون ناویان بە ئێمە نەگەیشتووە و ناتوانین دان بەوەدا بنێین کە پەڕاوی‌تری ئاینی بوە یان نەبووە، بەڵام ئەوەندە هەیە بڕوامان وایە کە هەر پەڕاوێ لەلایەن خواوە هاتبێ ئەوە راستەو گومانمان لەراستیدا نی‌یە.

پەڕاوە ناوبراوەکان یەکەمیان کە (صحف)ە بە هیچ شێوەیە نەماوەتەوە، وە (توراةو زبورو انجیل) هەرچەند لای گاورو جولەکەکان هەن‌و ماونەتەوە، بەڵام گۆڕینێکی هێجگار گەورەیان بەسەردا هێناوون و وشەکانیان لەشوێن‌و ماناو مەبەستی خۆیان لاداون، هەروەها هەندێکیان لێ لابردون‌و زۆر لە بیروڕای خۆیانیان خستۆتە سەر، بەرادەیەك کە ئەمڕۆ گاورو جولەکەکان خۆشیان دان بەوەدا دەنێن کە ئەو پەڕاوانەی لە کاتی خۆیدا بۆ (موساو داودو عیسا) پێغەمبەر هاتوون ئەوانە نەماونەتەوە، و ئەو پەڕاوانەی ئێستا لەبەردەستیاندایە وەرگێڕراوی ئەوانەی پێشوون، بەمەرجێ ئەوانیش بە

درێژایی چەند سەدان و ساڵانی رابردوو کەوتونەتە ژێر چەپۆکی گۆڕان و لابردن و بۆ زیادکردن کە تەنها بە خوێندنەوەیەکی روت بۆت دەردەکەوێ کە ئەم پەڕاوانە شتی وایان تێدایە بەهیچ شێوەیە ناگونجێ کەلەلایەن خواوە هاتبێ!

کەواتە ئەو پەڕاوانەی کە ئێستا لە جیهاندا بڵاوکراونەتەوە، ئەوانەیان کە نێرراون بۆ (موسا و داودو عیسا) پێغەمبەر ﷺ وە فەرموودەی خوا لەگەڵ وتەی مەردمدا تێکەڵ بوون کە هۆیەکی وا نەماوەتەوە بۆ ئەوەی فەرموودەی خوای پێ جیابکریتەوەو بەجوانی بناسرێ، بۆیە بڕوای ئێمە بەم پەڕاوانە لەڕووی ئەوەوەیە کە خوای گەورە هەرچۆنێك قورئانی ناردووە بۆ سەر مەردم هەرواش لەپێش خۆمانەوە پێغەمبەرانی ناردووەو یاساو بەرنامەی خۆی لەو کاتانەدا پێدا ناردوون، وە ئەم یاساو بەرنامەیەش هەر لەلایەن خواوە هاتووە بۆ بانگکردنی مەردم بۆ ئەو شارەزایی و رێبازە راستەی کە پێغەمبەری پێشوو گەیاندویەتی بەڵام دوای خۆی گۆڕاوەو لەسەر شێوە راستیەکەی خۆی نەماوەتەوە، چونکە یان گۆڕیویانە وەیا لێیان لابردووە وەیا قسەی خۆیانیان تێکەڵ کردووە.

وە قورئانیش دواترین پەڕاوە کە لەلایەن خواوە هاتووە بەڵام لەچەند روویەکەوە جیاوازی هەیە لەگەڵ پەڕاوە پێشووەکاندا:

١. جیاوازی یەکەم ئەوەیە کە پەڕاوە پێشووەکان وێنەی خۆیان (النسخ الأصلیة) ونبوون و نەماون، ئەوەی کە ئێستا لەبەردەستی مەردمدایە وەرگێڕاو(مترجمة)ی ئەوانە وەکو باسمان کرد. بەڵام قورئان هێشتا بەو پیت و وشانەی کە لەلایەن خواوە هاتووە هەر ماوەتەوەو بە هیچ جۆرێ ئەوەی پێی بوترێ گۆڕان رووی نەکردووەتە پیتێ یا وشەیە وەیا سەرو ژێرێکی.

٢. جیاوازی دووەم ئەوەیە کە لەم پەڕاوانەدا فەرموودەی خواو وتەی مەردم تێکەڵ بوون ئەبینی، قسەی مەردم و مێژووی نەتەوەیاتی و رەوشتی پێغەمبەران و پیاوچاکان و لێکۆڵینەوەو ئەو جۆرە تێگەیشتن و بریارانەی کە

زاناکـان لـه پـەڕاوەکانیان وەرگرتـووە، ئەمانـە هـەمووی لـەم پەڕاوانـەدا کۆکراوەتەوە بەشێوەیە کەبەئاسانی وتەکانی خوا نەناسرێن و جیاناکرێنەوە. بەڵام قورئانی پیرۆز هەر تەنها فەرموودەی خوای تێدایەو بە هیچ شێوەیە وتەیە تری تێکەڵ نەبووە، ئەو لێکۆڵینەوەو ڕەوشت و فەرموودەکانی پێغەمبەر و لەگەڵ مێژووی ئیسلام و ڕێبازو بڕیارانەی کە زانا موسوڵمانەکان نووسیویانەتەوەو هێناویانەتە بەرهەم، ئەمانە هەمووی بە جیاواز لە پەڕاوەکانی تردا نووسراونەتەوە کە بەهیچ شێوەیەك تێکەڵ نەکراون بە قورئانی پیرۆزەوە، بۆیە هەموو کەس زۆر بەئاسانی دەتوانێ فەرموودەی خوا لە وتەکانی تر جیا بکاتەوە.

٣. هەروەها ئەو پەڕاوانەی کە لەلایەن گەل و نەتەوەکانی ترە بەڵگەیەکی وانی‌یە کە بەتەواوی دیاری بکات ئەو پەڕاوە بۆ ئەو پێغەمبەرە هاتووە، بەڵکو زۆر پەڕاوی ئاینی واهەیە کە تەنانەت نازانرێ بۆ کێ هاتووەو لە چ کات و جێگایەکدا بۆی هاتووە، بەڵام هەزارەها بەڵگەی بەهێزو مێژووی هەیە کە دەری ئەخات و ئەیبڕێتەوە، بە شێوەیە کە هیچ کەس گومانی تێدا نامێنێ کە ئەم قورئانە بۆ محمدﷺ دابەزیوەو هاتوەتە خوارەوە، ئەمەش نەك تەنها شێوە گشتی‌یەکەی، بەڵکو هەموو ئایەتێکی ئەزانرێ کەی و لە کوێدا و بە چ هۆیەك هاتوەتە خوارەوە.

٤. پەڕاوەکانی‌تر هەریەکە بەزمانێ هاتونەتە خوارەوە کە ئەو جۆرە زمانانە لە زووەوە نەماوون و لە ناوچوون، لە هیچ ناوچەیە لە ناوچەکانی زەویدا نی‌یە کە ئێستا بەو زمانانە بدوێن و وتوێژیان پێ‌بکەن، کەم کەمیش هەیە کە بەزانین بیانزانێ و لێیان تێ‌بگات، ئەمەیش وا ئەگەیەنێ کە ئەگەر پەڕاوەکان بە شێوەی خۆیشیان بمانایەوە دیسان مەردم بە گران لێیان تێئەگەیشتن و بەرنامەی ژیانیان لێ وەرئەگرتن، بەڵام قورئان بە زمانێك هاتووە کە هێشتا ئەم زمانە زیندووە، بەسەدان ملیۆن مەردم گفتوگۆی پێ‌ئەکەن و پێی ئەژین و بە هەزاران ملیۆن مەردم ئەیزانن و لێی تێئەگەن، وە لە زۆر قوتابخانەو

دانیشگاکانی جیهاندا ئەخوێنرێتەوەو ئەوترێتەوە، وە ئەگەر یەکێ ماوەی نەبێ کە زمانەکە فێربێ، هەمیشە یەکێکی دەست کەوتووە و دەستی ئەکەوێ کە ماناو مەبەستو داخوازیەکانی پێبگەیەنێو بۆی روون بکاتەوە.

٥. ئەو پەڕاوانەی کەلای گەلو نەتەوەکانی تر هەن، هەریەکە ئاراستەی گەلێ وەیا نەتەوەیەکی تایبەتی کراوون، بە شێوەیە کە ئەگەر سەیری بڕیارو فەرمانەکان بکەیت ئەبینی زۆربەیان بۆ کاتێکی تایبەتی بووە، بەپێی پێویستو باری ژیانی ئەو نەتەوەیە لەو کاتەدا، وە مەردمی ئێستا هیچ پێویستیان بەو بڕیارانە نەماوەو ناگونجێ کە پەیڕەوییان بکەن، ئەمەیش ئەوەمان تێئەگەیەنێ کە ئەم پەڕاوانە هەر بۆ ئەو کاتەو بۆ ئەو چینە بوونو بەس. وەپەڕاوێکی وایان تێدا نییە کە بۆ هەموو مەردم دەست بدات، تەنانەت ئەو گەلە تایبەتیەش کە ئەم پەڕاوەیان بۆ هاتووە وانەبووە کە هەتا ئەم گەلە مابێ هەر ئەمە پەڕاویان بێ. بەڵکو بۆ ماوەیەکی کورتو دیاریکراو بۆیان نێرراوە. بەلام ئەگەر لەم روەوە سەیری قورئان بکەیت ئەبینی کە فەرموودەکانی ئاراستەی هەموو مرۆڤێ کراوە هەر لەبەر ئەوە کە مرۆڤە، ئەو کەسەی کە ئەیخوێنیتەوە هەرگیز نایە بە بیریا کەتەنانەت بەندێکی ئاراستەی گەلێ کرابێ نەك گەلەکانیتر، هەروەها فەرموودەو بڕیارەکانی بۆ پەیڕەوکردن دەست ئەدەن. لە هەموو ناوچەیە لە ناوچەکانی زەویداو لە ناو هەموو گەلێ لە گەلەکانی جیهان، ئەمەیش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئەم پەڕاوە بۆ هەموو جیهانەو هەتا هەتایە..

٦. پەڕاوە پێشووەکان هەرچەند خالی نەبوون لە ئاوەڵناوی راستیو چاکەکردنو شتی وا، وە هەرچەند بنچو بنەکەکانی رەوشتو چاکەیان بە مەردم گەیاندووە، وە رابەری مرۆڤیان کردووە بۆ رێگای راستو بانگیان کردووە بۆئەوەی بەپێی پێخۆشبوونی خوای پەروەردگار ژیانی خۆی بەسەر بەرێ. بەلام لەگەل ئەوەشدا پەڕاوێکی وایان تێدا نییە کە توانیبێتی هەرچی چاکەو رەوشتی باش هەیە هەمووی کۆکردبێتەوەو هیچی بەجێ نەهێشتبێت،

هەرتەنها قورئانە کە هەرچی چاکەو ئامۆژگاری بەسوود هەیە لە پەڕاوەکانی پێشوودا هەمووی لە خۆیدا کۆکردوەتەوە، هەروەها لەم رووەوە چیتریش ماوەو هەیە لە فەرمانی بەکەڵكو بڕیاری بەنرخ هەمووی تێدایەو هیچی بەجێ نەهێشتووە.

٧. وەلەبەر ئەوە کە پەڕاوە پێشووەکان دەستی مەردمیان تێبڕاوە زۆر شتی وایان تیدایە کەبەهیچ جۆرێ لەگەڵ عەقڵو ژیریی مرۆڤدا ناگونجێو رێك ناکەوێ، وەپڕکراوون لەشتی بێکەڵكو پڕپووچ، کە مێشکی مەردمیان پێتێك ئەچێ، وەبگرە هەندێکیان شتیوایان تێدایە کە بانگی مرۆڤ ئەکات بۆ بێرەوشتیو کاری خراپو ناپەسەند. بەڵام قورئانی پیرۆز بەبێگەردیو خاوێنی خۆی ماوەتەوەو لەم جۆرە شتانە هیچی تێکەڵ نەکراوە، وەبەهیچ شێوەیە دەستی مەردمی تێنەبراوەو شتێکی وای تێدا نییە کە لەگەڵ عەقڵو ژیریی مرۆڤدا نەگونجێ، یا بتوانرێ بە درۆ بخرێتەوە، فەرمانو بڕیارێکی وای تێدا نییە کە زیان بە مرۆڤ بگەیەنێ یان دەستدرێژی لێبکات، وەیا ونی بکاتو لە رێگای راست بیترازێنێ، هەروەها شتێکی وای تێدانییە کە بۆنی بێرەوشتیو بەرەڵڵای لێبێت، پڕیەتی لە ئامۆژگاری بەنرخو کردەوەی باشو دادپەروەری، و بەباشترین شێوە مەردم بانگ ئەکات بۆ رێگای راستو بۆ بەرزترینو جوانترین یاساو بەرنامەی ژیان.

ئەمانەیە ئەو جیاوازیە باشانەی کە قورئانی لە هەموو پەڕاوەکان پێجیا ئەبێتەوە، وەهەر لەبەر ئەمەیە فەرمان دراوە بەهەموو دانیشتووانی ئەم زەویە کە تەنها بە قورئان بڕوا بهێننو شوێنی یاساو بڕیارەکانی ئەو بکەونو جێبەجێی بکەن، چونکە ئەوپەڕی ئەوەی کە لەوانە بێ مرۆڤ پێویستی پێی ببێ لەبابەت رابەریو رێگا نیشاندان بۆئەوەی کە مەردم بەپێی پێخۆشبوونی خوای پەروەردگار ژیانی بەسەر بەرێ، هەمووی تێدایەو دیاری کراوە دوور لە بچوکترین کەمو کوڕیەك، کەواتە مرۆڤ دوای ئەوەی کە قورئانی بۆ هات ئیتر پێویستی بە پەڕاوێکیتر نییە.

جا ئێستا چونکە جیاوازی قورئان‌و پەڕاوەکانی‌ترت بۆ دەرکەوتووە، زۆر چاك ئەزانی جیاوازی لە نێوان بڕواکردن بە قورئان‌و پەڕاوەکانی‌تردا چی‌یە چونکە بڕواکردن بە پەڕاوەکانی‌تر تا ئەو رادەیە دانیان پیّدا ئەنێین‌و بڕوامان هەیە کە لەلایەن خواوە هاتوون، وە ئەوانیش هەر بۆ ئەم مەبەستە گەورەیە هاتوون کە قورئان هاتووە بۆ تەواوکردنی. بەڵام بڕواکردنمان بە قورئان لەم رووەوەیە کە هەمووی فەرموودەی خوایە، وە تەنها هەر ئەو راستە و وشەکانی هەمووی وەك خۆی ماوەتەوەو پارێزراوەو هەموو رستەیەکی راستەو گومانی تێدانی‌یە، وە شوێنکەوتن‌و بەگوێکردنی هەموو فەرمانەکان هەریەکە لە سنووری خۆیاندا پێویست(فریضة)ە، وەهەرچی پێچەوانەی قورئان‌و بڕیارەکانی ئەو بێ بۆ لابردن‌و پشتگوێ خستن باشە.

## بڕواکردن بە نێرراوانی خوا (الإيمان برسل الله)

دوای بڕواکردن بە پەڕاوەکانی خوا، فەرمانمان پیّدراوە کە بڕواشمان ببێ بە پێغەمبەرانی خوا، لەبەشی رابردوودا باسمان کرد کە هەموو گەل‌و نەتەوەکانی جیهان پێغەمبەرانیان بۆ نێرراون، وە ئەوانیش بانگی مەردمیان بۆ ئاینی ئیسلام کردووە، ئەو ئاینەی کە دواترین پێغەمبەریان محمدﷺ بانگی بۆ کردووە، وەك ئەوە وایە کەوا پێغەمبەرەکان هەموویان یەك تیرەو رەگەز بن و هەرکەسێ یەکێکیان بەدرۆ بخاتەوەو بڕوای پیّنەبێ ئەوا هەموویانی بە درۆ خستوەتەوەو بڕوای پێیان نی‌یە، وەهەر کەسێ یەکێکیان بەڕاست بزانێ‌و بڕوای پێبکات ئەو بڕوایە لەسەری پێویست ئەکات کە بڕوای بە هەمویان ببێ‌و بەڕاستیان بزانێ، وای دابنێین (١٠) پیاو هەیە، ئەم پیاوانە هەمویان یەك شت ئەڵێن‌و یەك بەرنامەیان هەیە، یەکێکیانت بەراست زانی‌و بڕوات پێکرد پێویستە بڕوا بە هەمویان بکەیت‌و بەراستیان بزانی، وەئەگەر یەکێکیانت بەدرۆ خستەوەو بەراستت نەزانی ئەوە هەمویانت بەدرۆ خستوەتەوەو بەراستیان نازانی، بۆیە ئەوکەسەی کە جیاوازی لە نێوان پێغەمبەرەکاندا

ئەكات بڕوای بە هەندێكیان هەیەو بڕوای بە هەندێكیان نی‌یە، ئەوە بەڕاستی كافرە، واتە بێبڕواو خوانەناسە، پێغەمبەرمان محمد ﷺ بۆی باسكردووین كە ژمارەی ئەو پێغەمبەرانەی هەتا ئێستا نێرراون بۆلای ئادەمیزاد (١٢٤٠٠٠)سەدو بیستو چوار هەزار پێغەمبەر ئەبن.

ئەگەر بیرێ لەتەمەنی ئەم جیهانەو ئەو هەموو گەلو نەتەوەیانە بكەینەوە كە هاتوونو ڕۆیشتوون، ئەم ژمارەیە بە زۆر نازانین، ئینجا ئەوانەیان كە خوا لە قورئاندا ناوی هێناون بۆی باس فەرمووین، پێویستە بەو شێوەیە بڕوامان پێیان ببێ، وە ئەوانەیان كە قورئان ناوی نەبردوونو بۆی باس نەكردووینو لێیان بێدەنگە، ئەبێ بڕوا بەوانیش بكەینو بزانین كەلەلایەن خواوە نێرراوون بۆلای بەندەكانی بۆئەوەی ڕێگای ڕاستیان پیشان بدەنو ئامۆژگاریان بكەن.

هەموویان ڕاستگۆ بونو بەرنامەكەیان ڕاست بووە، كەواتە بڕوامان هەیە بەهەركەس كە لەوانەیە پێغەمبەر بووبێو نێررابێ بۆ ولاتی هندستانو چینو ئێرانو میسرو ئەفەریقاو ئەوروپاو بۆ هەموو ناوچەیە لە ناوچەكانی رووی زەوی.. بەلام یەكێكیان بە تایبەتی، ئێمە ناتوانین بڵێن: ئەمەیان پێغەمبەر بووە، یان پێغەمبەر نەبووە، ئەویش لەبەرئەوە چونكە لەم بابەتەوە هیچمان پێنەوتراوە، وە هەروەها ڕاستیش نی‌یە كە یەكێ لەوانەی كە مەردمێكی زۆر شوێنیان كەوتوونو بە پێغەمبەریان ئەزانن، بە خراپە ناویان ببەینو شتی خراپیان دەربارە بڵێین. چونكە هیچ نەبێ دوور نی‌یە كە ئەویش لەكاتی خۆیدا پێغەمبەرێك بووبێو نێررابێ بۆلای گەلێ وەیا نەتەوەیە لەم هەموو گەلو نەتەوانەی جیهان، وە ئەویش دوای خۆی مەردم ئاینەكەیان گۆڕیبێ، هەروەكو ئاینی (موسی)و (عیسی)عليه السلام كە مەردم دوای خۆیان گۆڕییان بەپێی ئارەزوو مەبەستی خۆیان زۆر شتی پڕوپووچیان تێكەڵ كردن، وەئەگەر رایەكمان هەبوو ویستمان دەریبڕین، با لەبابەت یاساو پڕۆگرامو دروشمی ئاینەكەیانەوە بێ، لەسەر شێوەی ئێستاو لەم كاتەدا، وە بێدەنگ بین لەو كەسانەی كەلەكاتی خۆیدا دایانمەزراندووە، نەك شتێ بڵێین پێچەوانەی ڕێزگرتنی نێرراوێ لە

نێرراوەکانی خوا بێ.

وە هیچ جیاوازی‌نی‌یە لە نێوان پێغەمبەرمان محمدﷺ ونێوان پێغەمبەرە پێشووەکانی‌تردا لەرووی ئەوەوە کە هەموو راستگۆبوون‌و نێرراوی خوای پەروەردگارن، و هەموویان رێگای راست نیشانی مەردم ئەدەن بۆیە پێویستە بڕوامان بە هەموویان ببێ بەبێ جیاوازی.

ئەو جیاوازیەی کە لەنێوان پێغەمبەرمان محمدﷺ و پێغەمبەرەکانی تردا هەیە لەم سێ رووەی خوارەوەیە:

١. ئەم پێغەمبەرو نێرراوانە هەریەکە بۆ گەلێکی تایبەتی‌و بۆ ماوەیەکی دیاری‌کراو نێرراون، بەڵام پێغەمبەرمان محمدﷺ بۆهەموو لایەکی جیهان نێرراوە هەتا رۆژی دوایی، هەروەکو لە پێشەوە زانرا.

٢. بەرنامەو ئامۆژگاری ئەم پێغەمبەرانە لەناوچوون‌و لەسەر شێوەی یەکەمجاریان نەماوون، وەئەگەر شتێکی کەمیش مابێ، لەناو چیرۆك‌و داستانە دەستکردو پڕوپووچەکاندا ونبووەو ناناسرێتەوە، بەڵام پێغەمبەرمان محمدﷺ یاساو بەرنامەکەی هەروەها چۆنیەتی ژیانی فەرموودەکانی یەك بەیەك هەڵگیراوون‌و پارێزگاری کراون لەناو ئەو هەموو پەڕاوو پەڕتووکانەی کە لەبەردەستماندان، بەڕاستی ئەو پێغەمبەرەی کە هێشتا زیندوو بێ‌و نەمردبێ، وە شیاوی ئەوەبێ کە مەردم شوێنی فەرموودەو ئامۆژگاریەکانی بکەون تەنها پێغەمبەرمان محمدەﷺ .

٣. ئەو بەرنامەو ئامۆژگاریانەی کە پێغەمبەرە پێشوەکان هێناویانە، بەرنامەو یاسایەکی تەواو نەبوون کە پێویستی مرۆڤ لە ئەمڕۆدا تەواو جێبەجێ‌بکەن، هەر پێغەمبەری هاتبێ خەریکی ئەوە بووە کە بەرنامەی پێغەمبەری پێشوو راست بێتەوەو زیندووی بکاتەوە، هەندێکی لێ لابردووەو هەندێکی بۆ زیادکردووە، هەروا بەم شێوەیە سەرکەوتن‌و چاك بوون‌و پێشکەوتن پێش هاتنی پێغەمبەرمان محمدﷺ سوڕی دیوەو کاری خۆی کردووە، بۆیە خوای پەروەردگار نەیکردووە کە ئەو ئامۆژگاریە ناتەواوانە پارێزگاری بکات‌و

بیانهێڵێتــەوە، چونکــە مــەردم پێویســتی بــەوە نی‌یــە کــە بەرنامــەو یاســای ناتەواویان بۆ هەڵبگیرێ، بۆ کاتێ کە بەرنامەیەکی لەوەی پێشوو تەواوتریان بۆ ئەنێرێ... تا لـەدواییدا پێغەمبـەرمان محمـد ﷺ بە ئاینی ئیسلامەوە نێررا کـە بەرنامەو پرۆگرامێکی وایە لە هەموو روویەکـەوە تـەواوەو هیـچ کـەم‌و کورپیـەکی تێدا نی‌یـە، بـەم شێوەیە هـەموو بەرنامـەو پرۆگرامـی پێغەمبـەرە پێشـووەکان بـەهاتنی بەرنامـەو پرۆگرامـی پێغەمبـەرمان محمـد ﷺ ســڕراوەتەوەو بۆئــەوە ناشێن کە پــەیرەوی بکرێــن، چونکــە شــوێنکەوتنی بەرنامــەی ناتــەواو لەگــەڵ بوونــی بەرنامــەی تــەواودا پێچەوانــەی عــەقڵ‌و ژیــری‌و تێگەیشــتنی تــەواوە. وەهـەروەها هەرکەسێ شوێنی ئەم پێغەمبـەرە ﷺ بکـەوێ ئـەوە شـوێنی هـەموو پێغەمبـەرەکانی تـر کـەوتووە، ئەمــەیش لەبـەر ئەوەیـە چونکـە هـەرچی بریــارو ئامۆژگــاری بــەنرخ کــە لــە بەرنامــەو پرۆگرامــی پێغەمبــەرە پێشــوەکاندا هەیــە هەمووی لەبەرنامەی ئەم پێغەمبەرەدا هەیەو دەست ئەکەوێ، وە هەر کەسێ واز لەم پێغەمبەرە بێنێ‌و شوێنی پێغەمبەرێکی‌تر بکەوێ بەلای خۆیەوە ئەوا خۆی بێبەش کردووە لە زۆر چاکەو ئامۆژگاری بە سوود کە لـەم دواییـەدا خراوەتە سەر پەیام‌و بەرنامەی پێغەمبەران.

بۆیە لەسەر هەموو ئادەمیزاد پێویستە کە بڕوا بهێنن بە محمـد ﷺ و شوێنی بکـەون. وە پێویستە موسوڵمان بڕوای بەم پێغەمبـەرە محمـد ﷺ ببێ لــەم ســێ رووەی خوارەوە:

١. بزانێ کە پێغەمبەرێکی راستەو لەلایەن خواوە نێرراوە.

٢. بزانــێ کــە پــەیام‌و بەرنامەکــەی تــەواوەو هیــچ هەڵــەو کــەم‌و کورپیــەکی تێدانی‌یە.

٣. وە بزانێ دواترین کەسێکە کە لەلایەن خواوە نێررابێ، وە ناردنەکەشی بۆ هەموو گەل‌و نەتەوەیەکە هەتا رۆژی دوایی، وە بەجوانی بزانێ کەلە دوای ئەو مرۆڤێکی‌تـر نایــەت کــە مــەرجی ئیســلام بــوون ئــەوە بــێ بــڕوای پێ‌بکــات، وە هەرکەس بڕوای پێ‌نەکات بە خوانەناس‌و بێ‌ئاین(کافر) دابنرێت.

## بڕواكردن بەڕۆژی دوایی (الإیمان بالیوم الآخر)

پێنجەم شتێ كە پێویستە بڕوای پێبكەین بریتی‌یە لە بڕواكردنمان بەڕۆژی دوایی، وە ئەوەی كە لە بابەت ئەم ڕۆژەوە پێویستە بڕوامان پێ‌ببێ ئەمانەی خوارەوەیە:

١. پێویستە بڕوامان وابێ كە خوای پەروەردگار لە پاشەڕۆژدا ئەم جیهانە دوایی پێ‌ئەهێنێ، وە هەرچی تێدایە لە مەردمو زیندەوەرو دارو درەخت هەمووی لەناوئەچێ‌و نامێنێ، وە كاتێ ئەم دوا هاتن‌و نەمانەیە كە ناو ئەبرێ بەڕۆژی دوایی، وەیا ڕۆژی ڕەستاخێز.

٢. دوای ئەوە خوای پەروەردگار هەموو مەردم سەرلە نوێ زیندوو ئەكاتەوەو هەموویان كۆ ئەكاتەوەو لەبەردەم دادگای خۆیدا رایان ئەگرێ‌و ئامادەیان ئەكات بۆ لێپرسینەوە، ئەمەیە كە پێی ئەوترێ (الحشر) یان (البعث).

٣. دوای ئەوە هەموو كردەوەی مەردم چاك‌و خراپ بێ‌زیادو كەم لەبەردەم ئەم دادگایە ئامادە ئەكرێت.

٤. خوای پەروەردگار چاكەو خراپەی هەموو كەسێ ئەكێشێ، هەركەس تای چاكەی سەركەوتووبوو لێی خۆش ئەبێ، وەهەر كەسیش تای خراپەی زۆر بوو ئەوە سزای ئەدات.

٥. ئەوانەی كە لێیان خۆش ئەبێت ئەیانخاتە بەهەشت، وە ئەوانەی كە سزایان ئەدات ئەیانخاتە ناو ئاگری دۆزەخ.

## پێوستیمان بە بڕواكردن بە ڕۆژی دوایی

پێغەمبەرمان محمد ﷺ ئەم باوەڕ بە ڕۆژی دواییەی بە مەردم گەیاندووەو باسی كردووە، هەروەها پێغەمبەرو نێرراوە پێشوەكانیش باسیان كردووەو بە مەردمیان ڕاگەیاندووە، وە هەمیشە ئەم بڕوایە مەرجێك بووە لە مەرجەكانی ئیسلام بوون لە هەموو كات‌و چەرخێكدا، بەرادەیەكی وا هەركەس بڕوای بەم ڕۆژە نەكردبێ وەیا گومانی تێدا بووبێ ئەوا بەخوانەناس(كافر)یان داناوە،

چونکە بەبێ بڕواکردن بەڕۆژی دوایی هیچ مانایە نی‌یە لە بڕواکردن بەخواو پەڕاوەکان و نێرراوەکانی خوا، ئەمەش شتێکی ئاشکرایەو تێگەیشتنەکەی هیچ گرێیەکی تێدانی‌یە، بۆ نمونە ئەگەر پێت بڵێن: تۆ ئەو ئیشە بکە، لەم کاتەدا یەکەم شتێ کەوا بە بیرتا دێت ئەوەیە (ئاخۆ چ سودێك دەست ئەکەوێ ئەگەر بیکەی‌و تۆیش تووشی چ زیانێك ئەبیت ئەگەر نەیکەی؟). باشە ئەم پرسیارە بۆچی لە مێشکتا بەرپا ئەبێ؟

چونکە مرۆڤ لە سروشتیدا هەیە و رابردووە کە هەر کارێ سوودی بۆخۆی نەبێ گرنگیەك نی‌یە لە کردنیدا، لەبەرئەوە ئەبینی گورج و گۆڵ نی‌یە لە کردنی کارێکدا کە سوودی خۆی تێدا بەدی نەکات، وە خۆی لە کارێ ناگێڕێتەوە کە بزانێ تووشی زیان نابێ لێیەوە. ئابەم جۆرەیە کاری گومان و بێ‌بڕوایی، هەرشتێ کە گومانت بێ لە سودەکەیا، ناگونجێ کە حەزی لێ بکەیت و گورج و گۆڵ بی بۆ جێبەجێ‌کردنی، هەروەها هەر فرمانێکیش کە گومانت بێ لەزیانیدا ناگونجێ کە هەوڵ بدەی بۆ پاراستن و لێ دوورکەوتنەوەی، سەیری منداڵ بکە بۆچی خۆی ئەخاتە ناو ئاگرەوە؟ چونکە بەتەواوی نازانێ کە ئاگر شتێکی سوتێنەرە، هەروەها بۆچی منداڵان لەوانەکانی قوتابخانەو فێربوونی زانیاری دوا ئەکەون و خۆیان ئەشارنەوە؟ چونکە کەڵك و سوودی ئەو زانیاریەی کە مامۆستا ئەیەوێ بیخاتە بیرو مێشکیانەوە، ئەوان ئێستا نایناسن و تێی ناگەن. ئەوکەسەش کە بڕوای بە رۆژی دوایی دانەمەزراوە هەر بەم جۆرەیە، وا ئەبینێ کە بڕواکردن بە خواو بەگوێکردنی فەرمانەکانی لەم ژیانەدا هیچ سوودی نی‌یەو بێ‌کەڵکە، بەم پێیە هیچ سوودێ نابینێ لەوەدا کە فەرمانی خوا بەجێ‌بێنێ، وە هیچ زیانێکیش نابینێ لەوەدا کە سەرپێچی فەرمانەکانی خوا بکات، ئیتر چۆن هیوای ئەوی لێ ئەکرێ کە خۆی رابێنێ لەسەر گوێڕایەڵی و شوێنکەوتنی ئەو فەرمانانەی کە خوا بە پێغەمبەرەکان و لەناو پەڕاوەکانیدا ناردوویەتی.

وە ئەو کەسەی کە بڕوای بە رۆژی دوایی نی‌یە هیچ کەڵك و سودێ نی‌یە لە بڕواکەیدا، چونکە فەرمانەکانی خوا جێبەجێ ناکات و لە ژیاندا بە گوێرەی

پێخۆشبوونی خوا لە رەفتارو کرداردا ناکات، هەروەها کار لەم رادەیەدا راناوەستێ چونکە بڕوانەکردن بە ژیانێکیترو رۆژی دوایی یا بڕواکردن‌و دانەنان بەم رۆژەدا هەریەکە بەدەوری خۆی کارێکی گەورەو جیاوازی هەیە لە ژیانی مرۆڤدا، ئەمەیش وەکو لە پێشەوە باسمان کرد مرۆڤ پەلامار ناداتە کارێك‌و خۆی لە کارێك ناگێڕێتەوە تەنها بە گوێرەی ئەو سوودو زیانە نەبێ کە لەو کارەدا ئەیبینێ، جا ئەو کەسەی بیری فرەتیژی لە چوارچێوەی تەسکی ئەم ژیانە تێپەڕناکات، چۆن بۆ کردەوەی باش گورج‌و گۆڵ ئەبێ‌و هەوڵی بۆ ئەدا بێ‌ئەوەی کە بە هیوای سودەکەی بێت لەم جیهانەدا؟

بەڵام ئەو کەسەی کە دووربین بێ‌و بەو دووربینی‌یەوە سەیری دوارۆژ بکات، وە خۆی نەبەستێ تەنها بە ژیانی ئەم جیهانەوە تەماشای سوودو زیانی ئێستا ناکات، بۆیە هەمیشە راستی ئەگرێ‌و ناڕاستی بەرەڵلا ئەکات، وە هەمیشە هەر چاکە ئەکات‌و بەلای خراپەدا ناڕوات، با لەپێناوی ئەو چاکەکردنەدا گەورەترن زیانی تووش ببێ لەم ژیانەدا، وە خراپەکەش گەورەترین سوودو قازانجی پێ‌بگەیەنێ، بەڵام هەر لەم ژیانەدا، چونکە سوودو قازانجی دواڕۆژو ژیانی نەبڕاوەی ئەوێی لە پێش چاو گرتووە

جا بائێستا لەم دوو جۆرە مرۆڤە بکۆڵینەوە، ئەزانین چ جیاوازیەکی گەورە لە نێوانیاندا هەیە، شتی باش‌و پەسەند لای یەکەمیان ئەوەیە کە خۆی سوودو قازانجی تێدا دەستکەوێ وەکو ماڵ‌و سامان، یا پێی ببێ بە خاوەنی زەوی یان ئۆتۆمۆبێلی چاك‌و کۆشك‌و تەلاری قەشەنگ، یا هیچ نەبێ ئافەرین‌و ناوبانگێکی دەستکەوێ‌و بە گەورە ناوی بەرن، یان خۆشی‌و شادیەکی تێدا دەست کەوێ کە کەف‌وکوڵی حەزو ئارەزووی خۆی دامرکێنێتەوە، هەروەها شتی خراپ‌و ناپەسەندیش لای ئەو تەنها ئەوەیە کە لەوانەبێ شتێکی وای لێ بکونجێ کە ئەو پێی ناخۆشبێ‌و حەزی لێ نەکات لەم ژیانەی ئێستادا، وەکو کەم‌و کوڕیە لەوانەبێ رووبکاتە ئەو ماڵ‌و سامانەی کە کۆی‌کردوەتەوە یان ئەیەوی کۆی‌بکاتەوە، یان تەندروستی پێ تێك بچێ، یان مەردم بە ناشیرین ناوی‌بەرن،

یان پێی سزا بدرێ، وەیا هیچ نەبێ ببێ بە هۆی پەستیو پەژارەیی خۆیی.

بەڵام چاکەو شتی باش لای دووەمیان بریتی‌یە لەوەی کە خوا پێی خۆش بێ، شتی خراپو ناپەسەندیش بریتی‌یە لەوەی کە خوا پێی ناخۆش بێ، لەبەر ئەوە هەموو کات چاکە لای ئەو هەر چاکەیەو ناگۆڕێ، ئەگەر چی هیچ سوودی خۆیشی تێدا نەبێ لەم ژیانەدا، یا تووشی تاقیکردنەوەو گیروگرفتی گەورەش ببێ لەسەر ئەو چاکەیەو لە پێناویدا، چونکە هیچ گومانی نی‌یە کە خوای گەورە پاداشتی ئەداتەوەو سودو قازانجی خۆی لەوێ دەست دەکەوێ، هەروەها خراپە لای ئەو هەر خراپەیەو گۆڕینی بەسەردا نایەت با بەهیچ شێوەیەك ئەو خراپەیە زیانی ئەوی تێدا نەبێ، یا هەزاران سوودو قازانجی خۆی تێدا بێ، چونکە زۆر چاك ئەزانێ ئەگەر لەم جیهانەدا سزای ئەو خراپەیە نەچێژێ، لە دواڕۆژدا تۆڵەی ئەو خراپەیەی لێ ئەسێنرێ، بەپێی ئەم دوو هەستەو ئەم دوو بیروڕایە کە لەیەکتری جیاوازن مرۆڤ ڕێگایەك لەم دوو ڕێگایە لە ژیانی خۆیدا ئەگرێتەبەر، ئەو کەسەی بڕوای بەم ڕۆژی دواییە نەبێ هەرگیز لە ڕێگای ئیسلامەتیدا هەنگاو نانێو ناڕوات، بۆ نمونە: لەکاتێکدا کە ئاینی ئیسلام پێی ئەڵێ: ئەو زەکاتەی بەسەرتەوەیە مافی هەژارانو دەستکورتانە ئەبێ بیاندەیتێو هیچ مەبەستێکیشت نابێ ببێ تەنها پێخۆشبوونی خوای گەورە نەبێ، ئەو لە وەڵامدا ئەڵێ: زەکات دان لە ماڵو سامانم کەم ئەکاتەوە، پێویستە وەرگرم نەك زەکات بدەم، وە ئەبێ قەرزارەکانم هەموو رابکێشم بۆ دادگا، ئەگەر دادگا فەرمانی بۆ دام ئەبێ دەست بگرم بەسەر ئەوەی کە هەیانە لە ماڵو سامانو کەلو پەلی ناوماڵ.

هەروەها لە کاتێکدا کە پێی ئەڵێی: ڕاستگۆ بەو هەرگیز درۆ هەڵمەبەستە با لە ڕاستکردنیشتدا تووشی زیان ببیو لە درۆکردندا سوودت دەست کەوێ، پێت ئەڵێ: چۆن ڕاستگۆ بم کە تووشی زیانم بکات؟ وە بۆچی لە درۆ خۆم بپارێزم ئەگەر سوودو قازانجم تێدا دەست کەوێو نەترسم کە مەردم بزانن‌و بە خراپە ناوم ببەن و باسم بکەن؟!

له کاتێکا به ڕێگایەکدا ئەڕوا لەوانەیە شتێکی بەنرخی دەست ئەکەوێ، لەم کاتەدا ئایینی ئیسلام پێی ئەڵێ: ئەمە ماڵی تۆ نی‌یەو پێویستیت پێی نی‌یەو وەری‌مەگرە، بەڵام ئەو بەسەرسامیەکەوە پێت ئەڵێ: بۆچی واز له شتێ بێنم که بەبێ ئازار دەستم کەوتووە، وەکەسێکی وایش نی‌یە کە پێم بزانێ و پۆلیسخانەم لێ ئاگادار بکات، و لە دادگا شایەتیم لەسەر بدات، یا لەناو مەردمدا ناوم بزڕێنێ و بێ‌ئابڕووم بکا، دەی ئیتر بۆچی لەم ماڵە کەڵك وەرنەگرم و لەبەرژەوەندی خۆما بەکاری نەهێنم؟

یا کەسێك بەدەست پاکی ئەزانێ و سپاردەیەکی ئەداتە دەست، بەڵام دوای ماوەیە ئەو کەسە ئەمرێ، ئیسلام لێرەدا پێی ئەڵێ: نەکەی ناپاکی لە سپاردە بکەیت و نیازی خواردن بتگرێ، چونکە لە ڕۆژی دوایی ڕسوا ئەبی و سزات دۆزەخ ئەبێ، کەواتە بە زووترین کات بیدەرەوە بە خزم و کەس و کاری مردووەکە، بەڵام ئەو چی بڵێ باشە؟! پێت ئەڵێ: بۆچی کەسێ هەیە کە شایەتی بداو بزانێ کەفلان مردوو سپاردەیەکی لای من داناوە؟ یان خزمەکانی بە شتی وا ئەزانن؟ ئەگەر بۆم بکرێ کە ئەم ماڵە بەئاسانی بخۆم و لە دادگاو شتی وا نەترسم و پێی بێ‌ئابڕوو نەبم ئەڵبەتە من شێتم ئەگەر بیدەمەوە بە خاوەنەکەی!!

بەکورتی ئەوکەسەی کە بڕوای بە ڕۆژی دوایی نی‌یە هەموو کاتێ کە ئایینی ئیسلام بانگی ئەکات و ڕێگای ڕاستی نیشان ئەدات ئەو بەگوێی هەوەس و ئارەزووی خۆی ئەکات و ڕێگای چەوت و چەوێڵ ئەگرێتە بەرو پەسەندی ئەکات. چونکە نرخی هەموو شتێ لای ئەو ئەوەیە کەلەم کاتەداو لەم ژیانە کەم و کورتەدا سوودو قازانجی خۆی تێدا دەست کەوێ.

ئا لێرەدا زۆر باش بۆت روون ئەبێتەوە کە ناگونجێ مرۆڤ بەبێ ئەوەی بڕوای بەڕۆژی دوایی ببێ بە موسوڵمان دابنرێ.. بەڵکو لە ڕاستیدا بڕوا نەکردن بە ڕۆژی دوایی پلەی مرۆڤایەتی مرۆڤ نزم ئەکاتەوە بۆ پلەی جانەوەری و دڕندەیی، چ جای ئەوەی کە موسوڵمان بێ و لە ڕیزی بەندەکانی خواو پیاو چاکاندا بێ.

## راستی بڕواکردن بە رۆژی دوایی

لە پێشەوە تێگەیەشتین کە چۆن مرۆڤ پێویستی هەیە بەبڕواکردن بە رۆژی دوایی، وە زانیمان چ کەڵك و سوودێکی هەیە لە ژیانیدا. وا ئێستا ئەمانەوێ ئەوەت بۆ باس بکەین کە ئەم بڕوایە زۆر راستەو لەگەڵ ژیری(عقل)ی مرۆڤدا رێك و پێکە، ئەم بڕوایەمان هەرچەند لە پێغەمبەرەوە وەرگرتووە، وەلەم رووەوە تەنها پاڵمان بە ژیریو تێگەیشتنی مرۆڤەوە نەداوە، چونکە باوەڕمان بە پێغەمبەرو پەیامەکەی کردووە، وەتەنها ئەمەیە بەڵگەی گەورەمان بۆ داننان و باوەڕکردنمان بە رۆژی دوایی، بەڵام ئەگەر لە هەمان کاتدا ژیری خۆشمان بخەینە کارەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە ئەم بڕوایە نزیکترین باوەڕە لە ژیری(عقل)ی مرۆڤەوە.

لە جیهاندا لە بابەت رۆژیی دوایی و ژیانێکی ترەوە سێ جۆر باوەڕ هەیە کە ئەمانەن:

١. باوەڕێك ئەڵێ: هەرئەم ژیانە هەیە، ئێمە ئەژین و ئەمرین، وە ئیتر دوای مردن ژیانێکیتری سەر لە نوێ نییە، ئەمەیش بڕوای ئەوانەیە کە بڕوایان بە خوای گەورە نییە، ئەوانەی کە خۆیان بە زانای سروشت (علماء الطبيعيات Sciences) دائەنێن!!

٢. هەندێکیتر بڕوایان وایە کە مردن و ژیان یەك لە دوای یەك تازە ئەبنەوە بەسەر مرۆڤدا، بۆ ئەوەی هەر لەم جیهانەدا پاداشتی کردەوەی خۆی وەرگرێ، واتە ئەگەر لە ژیانی یەکەمدا کردەوەی خراپ بووبێ ئەوە لە ژیانی دووەمدا ئەچێتە وێنەی زیندەوەرێك وەك مەیمون و سەگ و پشیلەو شتیوا، یا ئەبێ بە درەخت یان مرۆڤێکی بێنرخ و پایە نزم، بەڵام ئەگەر لە ژیانی یەکەمدا کردەوەی باش بووبێ ئەوە زیاتر پلەی بەرز ئەبێتەوە، ئەمەیش بڕوای ئەوانەیە کە بیروڕای ئایینیان پێشکەوتوو ساغ و راست نیە.

٣. کۆمەڵی سێیەم: بڕوایان وایە کە رۆژی دوایی هەیەو مەردم هەموویان

سەر لە نوێ زیندوو ئەکرێنەوەو لەبەردەستی دادگا کۆئەکرێنەوەو ئامادە ئەکرێن بۆ لێپرسینەوەیان وە هەموو کەس لەوێداو لەو کاتەدا تۆڵەو پاداشتی کردەوەکانی خۆی ئەبینێ و وەرئەگرێ، وە ئەمەیش ئەو بڕوایەیە کە هەموو پێغەمبەران و نێرراوەکانی خوا باسیان کردووە.

با ئێستا لەم سێ بڕوایە بکۆڵینەوەو بیریان لێ بکەینەوە:

بڕوای یەکەم، باوەڕ پێکەرەکانی هەموو بەڵگەو پشتیوانێکیان ئەوەیە کە هێشتا ئادەمیزادێکیان نەدیوە کە پاش مردن زیندوو بێتەوە، هەر ئەوەیان دیوە کە مرۆڤ دوای مردن ئەڕزێ و لەناو گڵدا ون ئەبێ.

ئایا ئەمە بە بەڵگە دائەنرێ؟ تۆ کە دوای مردن کەست نەدیوە زیندوو ببێتەوە، ئەوپەڕی ئەوەیە ئەتوانی بڵێی: کە نازانرێ دوای مردن چی ئەبێ، بەڵام ئەو قسەیەی کە ئەڵێی دوای مردن ژیانێکی‌تر نی‌یە هیچ بەڵگەیەکت نی‌یە. بۆ نمونە پیاوێك فڕۆکەی نەدیوە هەرئەوەندە راستە ئەتوانێ بڵێ کە نازانێ فڕۆکە چۆنە، بەڵام ئەگەر بڕوای وابێ کەلە جیهاندا شتێك نی‌یە کە پێی بڵێن فڕۆکە، بێگومان هەموو کەس بە شێتی دائەنێن، چونکە یەکێ شتێکی نەدیبێ ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو شتە نی‌یە وەیا نابێ، بەڵکو هەموو جیهان رێك بکەون لەسەر ئەوە کە شتێکیان نەدیوە نابێ بە بەڵگە لەسەر نەبوونی ئەو شتە.

بەڵام بڕوای دووەم ئەڵێ: بۆیە ئەم ئادەمیزادە ئێستا ئادەمیزادە چونکە لە ژیانی پێش ئەم ژیانەی ئێستایدا کردەوەی چاکی کردووە لە کاتێکا کە ئاژەڵ (حیوان) بووە. ئاژەڵیش بۆیە لەم ژیانەیدا ئاژەڵە چونکە لە ژیانی پێش ئەم ژیانەیدا کردەوەی خراپی ئەنجام داوە لە کاتێکا کە ئادەمیزاد بووە. وە بەشێوەیەکی‌تر واتە ئادەمیزادیی ئادەمیزادو ئاژەڵیی ئاژەڵ و درەختیی درەخت بەپێ‌ی کردەوەی چاك یان خراپەیەتی لەپێش ئەم ژیانەیدا، وە لێرەدا پرسیارێك پەیدا ئەبێ ئەویش ئەم پرسیارەی خوارەوەیە: ئایا لەیەکەم جار چی‌بووە؟ ئەگەر ئەڵێی (ئادەمیزاد) بووە، کەواتە ئەبێ لە پێشا درەخت یا ئاژەڵ بووبێ، دەنا چ کردەوەیەکی خراپی کردووە تا وای لێهاتووە بووە بە ئاژەڵ یان

درەخت لە تۆڵەی ئەو کردەوە خراپانەدا کە کردویەتی ؟

بەراستی ئەوانەی کەئەم باوەڕەیان بڕیار داوە ناتوانن بڕیاربدەن کە یەکەم دروستکراو چی بووە؟ چونکە هەموو چینێ ئەبێ چینێکی تری لەپێشەوە هاتبێ بۆئەوەی چینی دوایی پاداش یان تۆڵەی چینی پێشو وەربگرێ، ئەمەیش لەوانەیە کە پێچەوانەی ژیری مرۆڤەو لەگەڵیا ناگونجێ.

ئینجا با بێینەوە سەر بڕوای سێ یەم: یەکەم بەندی ئەم بڕوایە کە خوای پەروەردگار ڕۆژێکی داناوە بۆئەوەی لەوڕۆژەدا ئەم جیهانە بگۆڕێ بەجیهانێکی تر، ئەمەیش بێگومان لەگەڵ ژیری مرۆڤدا ئەگونجێ، وەهەتا زیاتر لەکارگەی ئەم جیهانە وردبینەوەو بیربکەینەوە زیاتر بڕوامان پەیدائەبێ کە ئەم کارگەیە هەروا نامێنێتەوە، هەرچی هێزو بزووتنەوەی تێدایە هەموویان کاتێکی بڕاوەو سنورێکی دیاریکراویان هەیە هەر ئەبێ تەواوبن لەناوبچن، لەبەر ئەوە هەموو زاناکان لەو بڕوایەدان کەئەم خۆر(الشمس)ەی بەلاسەرمانەوەیە ئەبێ ڕۆژێ لەڕۆژان ساردبێتەوەو ئەم گەرماو ڕووناکی‌یەی نەمێنێ، وە ئەم هەموو ئەستێرانە ڕۆژێ لە ڕۆژان لەیەکتر بدەن و ئەم بوونەوەرە تەواو ببێ ودوایی بێت.

وە دیسان ئەم بڕوایە ژیانێکی‌تر ئەدا بە مرۆڤ، ئایا ئەمە لەوانەیە کە دوور و نەگونجاو بێ؟ ئەگەر وایە ژیانی یەکەم چۆن پەیدا بووە؟ بێگومان ئەو خوایەی کە ژیانی یەکەمی دروست کردووە ئەیشتوانێ جارێکی‌تر ئەم دروست بکاتەوە.

بەندێکی‌تر لەم بڕوایە ئەوەیە کە ئادەمیزاد هەموو کردەوەکانی تۆمار ئەکرێ و لەم ڕۆژەدا ئەخرێنەوە بەرچاوی، وە ئەمەیش شتێکە کە ئەمڕۆ لە ژیانی خۆماندا ئەیبینین و دەستمان ئەکەوێ.

مەردم لە ڕابردوودا وایان ئەزانی ئەو دەنگەی کە لەزار دەرئەچێ تێکەڵی هەوا ئەبێ و لەناو ئەچێ، بەڵام لەم دواییەدا زانراوە کە هەموو دەنگێ کارئەکاتە ئەو شتەی کە لەدەوروبەریدایە، وەزۆر چاک ئەتوانرێ کەلە دواییدا بگیرێ و زیندوو بکرێتەوە، وە مرۆڤ لەسەر ئەمە (گرامەفۆن)ی دۆزیوەتەوەو دایهێناوە، کە ئەمەش ئەوەمان تێئەگەیەنێ کە هەرچی لە ئێمەوە دەربچێ لە وتارو کردارو شتی‌وا

هەمووی بە شێوەیە لە شێوەکان تۆمار ئەکرێ‌و زیندوو ئامادە ئەکرێتەوە.

چوارەم شتێ کەلەم بڕوایەدا هەیە ئەوەیە کە خوای پەروەردگار پاداش‌و تۆڵەی بەندەکان ئەداتەوە لەسەر هەموو کردەوەیەکیان، ئەگەر چاك بێ پاداشیان چاکەیە، ئەگەر خراپیش بێ تۆڵەیان خراپەیە، کێ ئەتوانێ بڵێ: ئەمە دوورەو ناگونجێ؟ وەچی تێدایە کە پێچەوانەی عەقڵ بێ؟ بەڵکو ژیریی خۆی داوای ئەوە ئەکا کە ئەبێ خوای پەروەردگار لە ڕۆژێکا هەموو بەندەکانی کۆبکاتەوەو چاکەو خراپەیان بۆ جیابکاتەوە، چونکە ئێمە بەچاوی خۆمان ئەبینین مرۆڤ چاکە ئەکات‌و کەچی لەم جیهانەدا پاداشتەکەی دەست ناکەوێ، یان خراپە ئەکات‌و کەچی تۆڵەی لێ ناسێنرێ، چ جای ئەمە پیاوە باشەکان ئەبینین کە هەمیشە تووشی زیان‌و گیروگرفت ئەبن‌و خراپەکانیش بە ژیانێکی خۆش‌و کەش‌وفش ڕائەبوێرن، خۆ ژیریش لە هەردوو بارەکەدا داوای ئەوە ئەکات کە هەموو کەس تۆڵەو پاداشتی خۆی وەربگرێ بەتەواوی.

پێنجەم شتێ کەلەم بڕوایەدا هەیە ئەوەیە کە بەهەشت‌و دۆزەخ بڕیار ئەدا، وە ئەمەیش شتێکی دوورو نەگونجاو نی‌یە، چونکە خوایە کە خۆرو مانگ‌و مەریخ‌و زەوی دروست کردبێ، ئەی چۆن ناتوانێ بەهەشت‌و دۆزەخ دروست بکات؟

وە کاتێ کە مەردم کۆ ئەکاتەوە و ئامادەی دادگایان ئەکات پێویستە جێگایە ببێ بۆ ڕێزگرتنی ئەوانەی کە کردەوەی چاکیان هەیە، وە جێگایەکیش هەبێ بۆ تۆڵەسەندنەوە لە پیاو خراپ‌و تاوانبارەکان، لەم شتانە بیر بکەرەوە زۆر باش بۆت ڕوون ئەبێتەوە کە لەناو هەموو بڕواکانی ڕۆژی دوایدا ئەم بڕوایە لە هەموویان گونجاوترو نزیکترە لە ژیری(عقل)ی مرۆڤەوە.

سەرەڕای ئەمەیش ئێمە ئەم بڕوایەمان لەسەر زمانی پێغەمبەرەوە پێگەیشتووە، وە ئەویش لە ڕاستی‌و دەست پاکیدا لەو پلەو جێگایەدایە کەلە پێشەوە زانیمان، وە هەروەها ئەم بڕوایە پڕیەتی لە هەموو جۆرە سوودو چاکەیەك بۆ خۆمان لەم ژیانەدا، لەبەر ئەوە ژیری(عقل) وامان داوا لێ ئەکا کە

**بڕوای پێبکەین، وە بەهیچ شێوەیەك داوای ئەوە ناكات کە دوودڵ بین و گومانمان ببێ تیایدا بەبێ بەڵگە.**

## وشەیەکی پاك و بێگەرد

**ئەمە ئەو پێنج[٨] بڕوایەیە کە قەڵای ئاینی ئیسلامی لەسەر دانراوە وە هەموویان بە کورتی لە ئاوێنەی (لا الە الا الله محمد رسول الله)دا دەرئەکەون و دیارن، کاتێ وتت (لا الە الا الله) مانای ئەوەیە کە دانت بەوەدا ناوە تۆ بەندەی یەك پەرستراوی، ئەویش خوای پەروەردگارە، وە بەندەو گوێڕایەڵی هیچ کام لەو پەرستراوە ناڕەوایانە نیت کە شایانی پەرستن نین، هەروەها کاتێ ئەڵێی (محمد رسول الله) دانت ناوە بەوەدا کە (محمدﷺ) نێرراوی خوایەو لەلایەن خواوە نێرراوە بۆلای بەندەکانی، وەبەم هۆیەوە لەسەرت پێویست ئەبێ کە بڕوای تەواوت ببێ بە هەموو ئەو شتانەی کە بۆی باسکردووین لە بابەت ئاوەڵناوی خواوە، وە فریشتەکان و پەڕاوەکان و پێغەمبەرەکان و ڕۆژی دواییەوە.**

**وە هەروەها پێویستە بەو ڕێبازەدا بڕۆی کە ئەم پێغەمبەرە نەخشەکەی لە خواوە وەرگرتووە.**

---

[٨] لێرەدا ئەو پێنج بڕوایەمان باسکرد کە لە ئایەتی (آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ)البقـــرة/٢٨٥، و لە ئایەتی (وَمَنْ يَكْفُرْ بِاللّٰهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ)النســاء/١٣٦، وەر ئەگرین و بێگومان پێغەمبەری خوا بڕوا بە (قەزاو قەدەر)یشی بۆ باس کردووین، بەڵام لەراستیدا ئەم بڕوایە بەشێکە لەبەشەکانی بڕواکردن بەخوای پەروەردگار، هەر لەسەر ئەمە کە قورئان ئەم بڕوایەی لەگەڵ خوا بەیەك زانیندا باس کردووە، بۆیە منیش باسکردنی ئەم بڕوایەم لەگەڵ روونکردنەوەی رستەی (لاالە الا الله)دا بەبەشێ زانی، هەروەها ترازووی چاکەو خراپەو پردی (صراط) وە ناوی بەهەشت و دۆزەخ لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا بەسەربەخۆ باس کراوون، وەلە راستیدا ئەمانیش بەشێکن لەبەشەکانی بڕواکردن بە رۆژی دوایی.

## بەشی پێنجەم

# پەرستنەکان
# (العبادات)

* مـانـای پـەرسـتـن.
* نـوێـژ.
* ڕۆژوو.
* زەکـات.
* حەج
* پـاراسـتـنـی ئـیـسـلام.

لەبەشی چوارەمدا وتمان کە پێغەمبەر محمد ﷺ فرمانی داوە پێمان کە پێویستە بڕوامان ببێ بە:

١. خوای پەروەردگار بەبێ ئەوەی هاوەڵی بۆ بڕیار بدەین لەپەرستنندا.
٢. فریشتەکان.
٣. پەڕاوەکانی، بەتایبەتی قورئانی پیرۆز.
٤. پێغەمبەران و نێرراوەکانی، بەتایبەتی ئەو پێغەمبەرەیان کەدوای هەموویان نێرراوە محمد ﷺ.
٥. رۆژی دوایی.

ئائەمەیە بنچینەی ئاینی ئیسلام، جا هەرکاتێ بڕوات هەبوو بەم پێنج بڕوایە ئەوە چوویتە ریزی موسوڵمانەکانەوە، وە بووی بەئەندامێ لەو کۆمەڵەدا، بەڵام هێشتا ئیسلامەتیەکەت تەواو نەکردووە، چونکە مرۆڤ ئیسلامەتی تەواو نابێ و بە موسوڵمانی راست دانانرێ هەتا بەگوێی ئەو فەرمان و بڕیارانە نەکات کەلەلایەن خواوە نێرراوە، چونکە بڕواکردنت بەشتێ وات لەسەر پێویست ئەکات بەگوێی بکەیی و لەفەرمانی دەرنەچی، ئەم بەگوێکردنەیە پێی ئەوترێت (ئیسلام)، بێگومان دانت بەوەدا ناوە کە پەرستراوی تۆ تەنها پەروەردگارە، وە ئەمەیش وائەگەیەنێ کە ئەو خوایە گەورەی تۆیەو تۆش بەندەی ئەویت، هەندێ فەرمانت ئەداتێ کە بیکەی و هەندێ شتت لێ قەدەغە ئەکات کە نەیکەی، وە تۆش گوێڕایەڵ و بەندەی ئەوی. فەرمانی جێبەجێ ئەکەی و چی لێ قەدەغە کردبی نایکەی و لە سنووری دەرناچی. کەواتە ئەگەر دوای ئەمە بێگوێیی بکەی و لە فەرمانەکانی دەرچی، ئەوا هەر بەدەمی خۆت تاوانێکت کردووە پێی ئەوترێت دەرچوون لەفەرمانی گەورە، هەروەها دانت بەوەدا ناوە کە قورئان پەڕاوی خوایە. و ئەمەیش وا ئەگەیەنێ کە بڕوات کردووە هەرچی لەم پەڕاوەدا هەیە هەموی راستەو لای خواوە هاتووە، کەئەمەیش لەسەرت پێویست ئەکا بەراستی بزانی و پەیڕەوی

*بکەی لە هەموو فەرمانێکا کە ئەڵێ بیکە، و بگەڕێتەوە لەهەر کارێك کە قەدەغەی کردووە، لەدوای ئەوەی دانت بەوەدا ناوە کە محمدﷺ نێرراوی خوایە، کە ئەمەیش وا ئەگەیەنێ ئەم پێغەمبەرە هەر فەرمانێکت بداتێ یا هەرچیت لێ قەدەغە بکات هەمووی لەلایەن خواوەیە، ئەمەیش وات لەسەر پێویست ئەکا کە بەگوێی بکەیت و لە فەرمانی دەرنەچیت، لەبەر ئەوە ئیسلامەتیت تەواو نەکردووە هەتا هەموو کردەوەکانت جووت نەبن لەگەڵ بڕواکانتا، ئەگینا چەندە بڕواو کردەوەت جیابن ئەوەندەیش ئیسلامەتیت ناتەواوەو بڕواکەیشت لاوازە.*

*ئینجا فەرموو با ئەو ڕێگایە باس بکەین کە پێغەمبەر محمدﷺ فەرمانی داوە کە ئەبێ بیگرینە بەرو پیایدا بڕۆین بۆ بەسەر بردنی ژیانی خۆمان بە پێخۆشبوونی خوای پەروەردگار، یەکەم شتێ لەم بارەیەوە بریتییە لە (پەرستنە دیاریکراوەکان).*

## مانای پەرستن

پەرستن واتا بەندایەتی تەواو، تۆ بەندەیت و خواش گەورەو پەرستراوی تۆیە، بەندەیش هەرشتێ جێبەجێ بکا لە بەگوێکردنی گەورەی خۆیا ئەوە پەرستنە. بۆ نمونە کاتێ لەگەڵ مەردم ئەدوێی و قسە ئەکەی، خۆت ئەپارێزی لە قسەی خراپ و درۆو پاشملە قسەکردن(غەیبەت) و دواندنی پڕوپوچ، ئەویش لەبەر ئەوە چونکە خوا قەدەغەی ئەمانەی کردووە، وە بەوردی گەڕای بە دوای ڕاستی و قسەی بەکەڵك و سوودا، چونکە خوا ئەمانەی پێخۆشە، ئەوا قسەکردنەکەت بوو بە خواپەرستی، با ئەم قسانەش هەمووی لە پێویست و ئیش وکاری خۆیشتا بێ، ئەگەر لە کاتێکا لەگەڵ مەردم ئەژیت و بە بازاڕدا ئەڕۆیت بۆ کڕین و فرۆشتن، وە لەگەڵ باوك و براو خوشك و دایکتا ئەژیت و لەگەڵ هاوڕێ و ناسراوەکانتا کات ئەبەیتە سەر، بەڵام ئامۆژگاری و فەرمانانە

لەگەڵیان جووڵایتەوەو مافی کەست زەوت نەرکرد و مافی هەموو کەست لە شوێنی خۆیدا جێبەجێکرد، ئەمانەیش هەموو لەبەر ئەوە چونکە خوا فەرمانت ئەداتێ کەبەم شێوەیە لەگەڵ مەردم بجوڵێیتەوە، ئەوا بێگومان هەموو ژیانی خۆت لە خواپەرستیدا ئەبەیتە سەر، و ژیانت هەمووی بوو بەخواپەرستی، هەروەها ئەگەر دەستگیری هەژارێکت کرد، یا یارمەتی لێقەوماوێکت دا، یا برسیەکت تێر کرد، یا چوویتە لای نەخۆشێك، و لە هەموویاندا مەبەستت پێخۆشبوونی خوا بوو بێ ئەوەی بەتەمای سوودی تایبەتی خۆت بی، یان بۆ ئەوەی کە مەردم بەباشت بزانن، ئەوە هەموو ئەو کارانەت ئەبن بە خواپەرستی و خواناسین، هەروەها ئەگەر بازرگان بووی، یان بە پیشەسازیەکەوە خەریك بووی، یا هەر کارو ئەرکێکی سەرشانت جێبەجێکرد بە هەموو پاکی و راستیەکەوە، ئەمەیش بۆ ئەوەی کە لە خواوە نزیك بیتەوە، یان خەریکی ئیشێکی حەڵاڵ بی و لە شتی قەدەغەکراو(حرام) خۆتت پاراست، ئەوا ئەم هەوڵدان و تێکۆشانانەت هەمووی ئەبێ بە خواپەرستی، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانەت کردووە بۆ ئەوەی هۆی ژیان و رۆزی پەیدا بکەی.

بەکورتی ئەگەر لە هەموو ئیشوکارێکی ژیانتداو وە لەهەموو کاتەکانی تەمەنتا لە خوا بترسی و پێخۆشبوونی خوا لەبەرچاوی خۆت دابنێی و هەمیشە شوێن یاساو پرۆگرامی ئەو بکەوی وە هەر سودێ لە رێگای گوناهەوە دەستت ئەکەوی نەتەوێ و وازی لێ بێنی، هەروەها هەر لێقەومانێکت لە پێناوی ئەودا تووش بوو دان بە خۆتا بگری و ناخۆشی و نارەزایی دەرنەبڕی، ئەم هەڵوێستانەت هەمووی ئەبێ بە خوا پەرستی، خواردن و خواردنەوەو نووستن و بێداری و دانیشتن و هەڵسان و گەڕان و قسەکردن و بێدەنگیت لە ژیانی ئابەم جۆرەدا کە باسمان کرد، هەمووی خواپەرستی و لە خوا نزیك بوونەوەیە، ئا ئەمەیە خواپەرستی وە مانای پەرستنی راستیش ئەمەیە وە ئاینی ئیسلامیش ئەوەی ئەوێ کە مرۆڤ بکا بەبەندەیە کەبەم جۆرە پەرستنە خوا بپەرستێ لە

هـەموو کـاتو شـوێنێکدا، بـەڵام بـۆ ئـەم مەبەسـتە گەورەبـە چـەند جـۆرە پەرستنێکی دیاریکراوی داناوە بۆئەوەی مرۆڤ ئامادە بکات بۆ ئەم مەبەستە مەزنـە، لـەوە ئـەچێ ئـەم پەرستنە تایبەتیانـە پێگـەیاندنو راهێنـان بـن بـۆ ئـەو پەرستنە گەورەیە کە مەبەستی راستەقینەیەتی، جا هەرکەسێ ئەم پێگەیاندنو راهێنانە بە جوانی ببا بەڕێوە، دیارە ئەوە پەرستنە گەورەکـەش بـە ڕێكوپێکـی جێبەجێئەکات، بۆیە ئەم پەرستنانە وا دانـراون وەك پەرستن هـەر ئەمانـە بنو بەس، وە پێیان ئەوترێ (پایەکانی ئیسلام) واتە ئەو کۆڵەکانەن کە خانووی ئەم ئایینـە مەزنـەی لەسـەر دروستکراوە هـەروەکو خـانوو کـە پێویسـتی بەچـەند کۆڵەکەیـەك هەیـە کەبەسەریەوە راوەستێت، هـەروەها خـانووی ژیـانێکیش کـە ئیسلامیی بێ بەسەر ئەم کۆڵەکانەوە راگیرئەکرێو رائەوەستێ، بۆیە هەرکەسێ ئەم کۆڵەکانە بڕوخێنێ ئەوا خانووەکەی رووخاندووە.

## نـوێـژ

پایەی یەکەم لە پایەکانی ئیسلام (نوێژ)ە، لە راستیدا نوێژ بریتی‌یە لەوە کە تۆ لە شەوو رۆژدا پێنج جار یادی ئـەو کەسـەی کـە بڕوات پێهێنـاوە دووپـات بکەیتەوە، کە کاتێ رۆژت لـێ ئەبێتەوە پێش ئەوەی پەلاماری هیچ ئیشێ بدەی چەند کـاتێك لەبەردەسـتی توانـای خـوادا رائەوەستی بـە پـاكو خـاوێنی، دوای ئەوە دان بە بچوکیو بەندەیەتی خۆتدا ئەنێی بۆ خوا، بە پێوەو بە دانیشتنەوە و دەست لەسـەر ئەژنۆو سـەر لـە زەویـەوە داوای یارمـەتیو رێگـای راستی لـێ ئەکەی وە پەیمانی پەرستنو بەگوێکردنی بۆ تـازە ئەکەیتـەوە. وە جـار لـەدوای جـار هیـوای گەیشتن بـە پێخۆشـبوون، وە دوورکەوتنـەوە لـە پێناخۆشـی ئـەو دووبـارە ئەکەیتـەوە، وانەیـە لـە پـەڕاوە پیرۆزەکـەی (قورئـان) ئەخوێنیتـەوەو شایەتی ئەدەی لەسەر راستی نێرراوی ئەو، هەروەها ئەو رۆژە ئەخەیتەوە بیری خۆت کە بانگ ئەکرێی بۆ دادگاکەی بۆ ئەوەی پرسیاری کردەوەکانت لێبکرێ،

ئینجا پاداش‌و تۆڵەی خۆتت لەوێ دەست ئەکەوێ، بەم شێوەیەو بەم جۆرە ڕۆژێکی تازە لە تەمەنی خۆت دەست پێ‌ئەکەیت، دوای ئەوە چەند کاتژمێرێ بە ئیش‌و کارەوە خەریك ئەبی، سەیر ئەکەی وا لەپڕ بانگ وێژ بانگت ئەکات، وەرە بۆ یادی خواو جارێکی‌تر وانەکەی بەیانی دووبارە بکەرەوە بۆ ئەوەی نەك لە بیرت بچێتەوە، ئینجا تۆش لە جێگای خۆت هەڵئەسی‌و ئەڕۆی، وە کە بڕوای خۆتت تازە کردەوە ئینجا ئەگەڕێیتەوە بۆلای جیهان و چەند کاتێکی‌تر بە ئیش‌و کارەوە خەریك ئەبی، جارێکی‌تر بانگوێژ بانگت ئەکات بۆ نوێژی (عەسر) ئینجا ڕۆژ پشت هەڵئەکاو شەو دەست ئەکات بە هاتن، وە تۆیش چۆن ڕۆژت دەست پێکردەوە شەوەکەیشت هەروا دەست پێ‌ئەکەی بەیادو پەرستنی خوا نەوەك ئەم وانەیەت لەشەودا فەرامۆش بکەی، دوای ماوەیەکی کەم کاتی نووستن دێتە پێشەوەو نوێژی (خەوتنان) ئەکەی‌و بۆ دواجار یادی پەروەردگارت ئەکەی، چونکە ئێستا کاتی حەسانەوەو پشوودان‌و دڵئارامیە، وە ئەتوانی زۆر باش لەم کاتە سوود وەربگری‌و لە ماندوویەتی ڕۆژو ئێش‌و ئازاری ژیان پشوو بدەیت‌و بحەسێیتەوە، هەر نوێژە کە ڕۆژی پێنج جار بنچینەی ئیسلامەتیت ئەکوتێتەوەو بتەوی ئەکات، هەر نوێژە رات ئەهێنێ‌و پێت ئەگەیەنێ بۆ پەرستنێکی گەورەو بەربڵاو کە هەر ئەویشە مەبەستی گەورەو ڕاستەقینەی ئیسلام. وەك لە پێشەوە باسمان کردووە ..

هەر نوێژە کە ئەو بڕوایانەی پاك‌و خاوێنی تۆیان تیا کۆبۆتەوەو ئەیانخاتەوە بیرت‌و نایەڵێ بێ‌ئاگا ببی، بەم هۆیەوە گیانت پاك ئەبێتەوەو ڕەوشت‌و کردەوەکانت بەرزو جوان ئەبن. پێم ناڵێی لە دەستنوێژ گرتندا بۆچی هەر ئەو ڕێگا تایبەتیە ئەگری کە پێغەمبەرﷺ دیاری کردووەو گەیاندوویەتی؟ وە پێم ناڵێی لە نوێژەکانتا بۆچی هەر ئەو وشەو رستانە ئەخوێنی کە پێغەمبەر فەرموویەتی‌و دیاری کردووە؟ ئایا ئەمە لەبەر ئەوە نیە کە تۆ بەگوێکردنی پێغەمبەر لەسەر خۆت بە پێویست ئەزانی؟ بۆچی ئەو قورئانەی کەلە نوێژەکەتا

ئەیخوێنی هەڵەی تیا ناکەیتو بە ناڕاست نایڵێی؟ ئایا لەبەر ئەوە نییە کە زۆر چاك ئەزانیو بڕوات هەیە کە قورئان پەڕاوی خوایەو نابێ هەڵەی تێدا بکەین؟ کێیە لێی بترسی ئەگەر لە نوێژەکەتا وشەیە بخوێنی بێجگە لە ئەو وشانەی کە پێغەمبەرمان دایناوەو دیاری کردووە، یان ئەگەر هیچ نەخوێنی کێ هەیە کە گوێی لێبێو بزانێ خوێندووتە یان نا؟ ئایا تەنها لەبەر ئەوە نییە ئەزانیو بڕوات هەیە کە خوا ئەزانێو ئەوەی کە بە نهێنی لەدڵی خۆتەوە ئەیخوێنی لێی ئاگادارەو ئەیبیسێ؟ ئەوە کێیە لە خەو هەڵت ئەسێنیو بانگت ئەکا بۆ نوێژ؟ لە کاتێکا کەست لا نییەو تەنهای؟

ئایا جگە لەوەی کە بڕوات هەیە کە خوا ئەتبینێ چیتر هەیە؟ چییە لە ئیشوکارەکانت وازت پێئەهێنێو بەخێرایی ئەچی بۆ نوێژ کە کاتی هاتە پێشەوە؟ جگە لەو هەستەت کە ئەزانی خوا ئەمەی لەسەر پێویست کردوویت چیتر هەیە؟ چییە وا پاڵت پێوە ئەنێ بۆ نوێژ، بەیانیان لەکاتی سەرمای زستانداو نیوەڕوان لە گەرمای هاویندا و هەروەها ئێواران لەکاتی یاریو رابواردندا؟ ئایا جگە لەو هەستە کە ئەزانی خوا پێویستی کردووە لەسەرت شتێکیتر هەیە وا بەم شێوەیە پاڵت پێوە بنێ بۆ نوێژەکانت لەکاتی خۆیاندا؟ هەروەها لەچی ئەترسی ئەگەر نوێژ نەکەی یان هەڵەی تێدا بکەی؟ ئایا بۆ ئەمە هۆیەکیتر هەیە جگە لەوە کە دیارە لە خوا ئەترسیو ئەزانی لە دواڕۆژدا ئەگەڕێیتەوە بۆلای ئەو، وە لەبەردەستیا ئامادە ئەکرێی بۆ لێپرسینەوە؟

پێم بڵێ دوای ئەمانە هەموو، ئایا پێگەیاندنێكو پەروەردەکردنێکیتر هەیە لە جیهاندا کە باشتر بێ لە نوێژ بۆ ئەوەی مرۆڤی پێببێ بە موسوڵمانێکی تەواو و راستو رێك؟ ئایا پەروەردەو بە خێوکردنێکیتر هەیە بۆ ئادەمیزاد کە باشتربێ لە تازەکردنەوەی یادی خواو هەروەها هەمیشە لێی بترسێو بڕوای وابێ کە زۆر چاك ئاگادارەو ئەیبینێ، وە هەمیشە دادگای رۆژی دوایی لەبەرچاو بێو لەشەوو رۆژێکا چەند جارێ شوێنی پێغەمبەر بکەوێ، وە بەم

شێوەیە هەر ساتێ ناساتێ دەست بکات بە راهێنانو مەشقو ئامادەکردنی خۆی بۆ ئەوەی بە جوانی بتوانێ ئەركو پێویستیەکانی سەر شانی جێبەجێبکاتو هەستی لێپرسینەوەی تێدا بتەوو بەهێزتر ببێ؟ مرۆڤێ کە ئابەم جۆرە بێ لە کاتێکا کەلە مزگەوت دەرئەچێو بە ئیشوکاری رۆژانەی خۆیەوە خەریك ئەبێ هیوای لێ ئەکرێ کە زۆر باش لە خوا بترسێو شوێنی یاساو بەرنامەی ئەو بکەوێ لە هەموو ئیشو کارێکدا، وە لەوانەیە ئەگەر شەیتان ئیشێکی خراپی بۆ رازاندەوەو لەبەر چاوی جوانی کرد خێرا لە دڵی خۆیەوە بیر بکاتەوەو بزانێ کە خوا ئاگای لێیەو هیچ کارێکی لێ ناشاررێتەوە.

بەڵام ئەو مرۆڤەی کە دوای ئەم پەروەردەکردنو مەشقو راهێنانە هێشتا چاك نەبووە و لە خوا ناترسێو دەست ناکێشێتەوە لە خراپەو بێگوێی لە فەرمانەکانی پەروەردگار، ئەوە بە جوانی راهێنانو پەروەردەکردنەکەی جێبەجێ نەکردووە، یان لەبەر نەخۆشیو خراپیەکە کە لە سروشتی ئەو مرۆڤەدا هەیە، ئەگینا لەبەر کەموکوڕی راهێنانو پەروەردەکردنەکە نییە، سەرەڕای ئەمەش خوای گەورە بە توندی لە موسوڵمانەکان داوا ئەکات کە بە کۆمەڵ (جماعة) نوێژ بکەن، وە بە تایبەتی پێویستی کردووە کە هەموو هەفتەیەك نوێژی هەینی (جمعة) بکەن بە کۆمەڵو لەیەك شوێندا، خۆ گومانی تێدا نییە کە ئەم نوێژە بەم شێوەیە یەکێتیو خۆشەویستیو برایەتی لە نێوان موسوڵمانەکاندا دروست ئەکاو هێزێکی رێكو پێکیان لێ پێك ئەهێنێ، چونکە لەو کاتەدا کە کۆئەبنەوە، و خۆیان تەرخان کردووە بۆ خواو کڕنووشی بۆ ئەبەن دەست لە ئەژنۆو سەر لەسەر زەوی هەموویان بەجارێ لەیەك شوێنو لەیەك کاتی تایبەتیدا... هیچ گومانی تێدا نییە کە دڵەکان دەست لە ملو تێکەڵ ئەبن، وە هەستی برایەتیو خۆشەویستی لە ناویاندا گەشەئەکاو پەرەئەسێنێ، هەروەها نوێژ کردن بە کۆمەڵ رایان ئەهێنێ لەسەر ئەوەی کە بە

گوێی گەورەیە بکەن کە خۆیان و لە خۆیان هەڵیانبژاردووە، هەروەها رایان ئەهێنێ لەسەر یاساو ئاگاداری کاتەکان، وە لەناویاندا هەموو جۆرە بەزەیی و یەکسانی و خۆشەویستی و تێکەڵیەك ئەڕوێنێ، ئەبینی هەموویان وەکو یەك هەژارو دەوڵەمەند، گەورەو بچووك، بە هێزو بێ‌هێز شان بەشانی یەك راوەستاون کەسیان لە کەسیان زیاتر نین، هەمویان وەکو یەك بەندەی خوای پەروەردگارن. ئەمەی کە وتمان شتێکی کەمە لە کەڵکی نوێژ کە سوودو قازانجی تەنها بۆ خۆتان ئەگەڕێتەوەو نەك بۆ خوا چونکە خوای گەورە ئەم نوێژەی بۆ کەڵك و قازانجی تەنها بۆخۆتان لەسەرتانی پێویست کردووە، بۆیە ئەگەر جێبەجێی نەکەن پێی ناخۆشە چونکە خۆتان تووشی زیان ئەکەن، لەبەر ئەوە نی‌یە کە گوایە زیانێ بە خۆی بگات، سەیر کەن خوای پەروەردگار بە هۆی نوێژەوە چ هێزێکی گەورەی پێبەخشیوون، کەچی ئێوە گوێی نادەنێ! زۆر شتێکی شورەیی و ناشیرینە کە بەزمان بڕیاری خوایەتی پەروەردگارو بەگوێکردنی پێغەمبەر ئەدەن و دانتان بە لێپرسینەوەی رۆژی دواییدا ناوەو کەچی گەورەترین شتێ کە خوا لەسەری پێویست کردوون گوێی نادەنێ و جێبەجێی ناکەن؟! ئێوە لەیەکێ لەم دووشتە بەدەر نین: یان ئەبێ بڕواتان نەبێ کە خوا نوێژی لەسەر پێویست کردوون یان بڕواتان هەیەو بەڵام خۆتان ئەشارنەوە لە بەجێهێنانی، جا ئەگەر بڕواتان نی‌یە کە خوا پێویستی کردووە پەڕاوی قورئان بە درۆ ئەخەنەوە وە بڕواتان بە پێغەمبەر نی‌یەو ئەو داوایەتان کە ئەڵێن: بڕوامان پێیان هەیە داوایەکی راست نی‌یە، وەئەگەر بڕواتان هەیە کەلەلایەن خواوە پێویست کراوەو بەڵام نایشی‌کەن ئەوا تەنها ئەمەتان بەسە بۆ ئەوەی کە مەردم بڕواتان پێ‌نەکاو لە پاکی و راستی و دڵسۆزیتان دڵنیا نەبێ، چونکە ئەگەر ئێوە گوێ‌نەدەنە ئیشی خواو راست نەبن بەرامبەر ئەوەی کە پێویستی کردووە لەسەرتان، ئیتر چۆن هیوای ئەوەتان لێ ئەکرێ کە مافی مەردم ژێرپێ نەخەن و سپاردەو ئیش‌وکاریان بە رێك و پێکی ببەن بەرێوە؟!

# ڕۆژوو

پایەی دووەم لە پایەکانی ئیسلام (ڕۆژوو)ە، ئایا ئەزانی ڕۆژوو چی‌یە؟ ئەو وانەیەی کە نوێژ لە شەوو ڕۆژێکا پێنج جار ئەیخاتەوە یادمان، ڕۆژوو هەموو کاتێ بیرمانی ئەخاتەوە، ماوەی یەك مانگی تەواو لە هەموو ساڵێکا کە مانگی ڕەمەزان هاتە پێشەوە واز لە خواردن و خواردنەوە ئەهێنی هەر لە بەیانیەوە هەتا ئێوارە، لە کاتێکا ئەخۆیت و ئەخۆیتەوە، کە ڕۆژت لێ بوەوەو کە گوێت لەدەنگی بانگوێژی بانگی بەیانی بوو گورج دەست لە خواردن و خواردنەوە هەڵئەگریت، ئیتر دوای ئەوە هەزاران خواردن و خواردنەوەی نایابت بەرچاو بکەوێ تۆیش زۆر برسی و تینوو بیت بە هیچ شێوەیە لێیان ناخۆی و ناخۆیتەوە هەتا ڕۆژ ئاوا نەبێ، وەنەبێ هەر لەبەرچاوی مەردم شت ناخۆی، بەڵکو لە کاتێکیشا کە تەنهایت و کەست لەلا نی‌یە خۆت ئەگری و نزیکی خواردن و خواردنەوە ناکەویتەوە، بەم جۆرە لەم ماوەیەدا هەرلە بەیانیەوە تا خۆرئاوا ئەبێ یەك قووم ئاو ناخۆیتەوە، یەك پارو خواردن قووت نایەی، بەڵام ئەم خۆگرتنەت تا ماوەیەکی دیاری‌کراو درێژەی هەیە، چونکە هەر کە هەتاو نیشت و گوێت لە بانگی شێوان (مغرب) بوو زوو پەلامار ئەدەیتە شکاندنی ڕۆژووەکەت، ئیتر بە درێژایی شەو ئەتوانی بە دڵی خۆت بخۆیت و بخۆیتەوە وە نۆشی گیانت بێ، ئینجا کەمێ بیر بکەرەوە! بزانە ئەمە چی‌ئەکەیت و خەریکی چیت؟ بێگومان لە پشتی ئەمەوە لە خواترسان هەیەو بڕوای تەواوت هەیە کە خوا ئاگای لێتەو ئەزانێ چی ئەکەی و چی ناکەی وە بڕوات بە ڕۆژی دوایی و دادگاکەی هەیە، وە هەروەها زۆر بە پەرۆشەوە فەرمانی قورئان و پێغەمبەری خوا ئەبەی بەڕێوە، وە هەست بە لێپرسینەوەو ڕاهێنان و ڕاهاتن لەسەر خۆگرتن و ئارام و زاڵ بوون بەسەر حەزو ئارەزووی ناپەسەندت تێدا بەهێز ئەکات.

بەڵێ هەموو ساڵێ مانگی (رەمەزان) دێتو دەورەیەکی سی رۆژیت بۆ ئەکاتەوە بۆ ئەوەی زیاتر پەروەردە ببی لەسەر خورەوشتی بەرزو بەهێز، هەتا ئەبی بە موسوڵمانێکی تەواو رێکوپێك، وە ئەم خورەوشتە بەرزانە وات لێ ئەکەن کە بتوانی پەرستنە گەورەکە بەدرێژایی ژیانو لە هەموو کاتێکدا بە جوانی بەرێوە بەری.

سەرەڕای ئەوەیش خوای گەورە لەیەك مانگدا رۆژووی پێویست کردووە لەسەر هەموو موسوڵمانەکان بۆ ئەوەی هەموویان بە کۆمەڵ و بەجارێ بەرۆژوو بن نەك بە جیاجیاو هەرکەس بۆخۆی، ئەمەش دیارە سوودو کەڵکی زۆری تێدایە، ئەبینی هەرکە مانگی (رەمەزان) هاتە پێشەوە، ئاسمانێکی پاكو بێگەرد ئەکشێ بەسەر هەموو جیهانی ئیسلامدا کە پڕیەتی لە بڕوای خاوێنو لە خواترسانو بەگوێکردنی فەرمانو بڕیارەکانی پەروەردگاری مەزن، بەم شێوەیە بازاڕی رەوشت بەرزیو کردەوەی جوان بەرز ئەبێتەوە، خراپکاران بازاڕیان ئەشکێو سەرمایەی خراپەکانیان نرخی کەم ئەبێتەوە، بەندەکانی خوا لەهەموو لایەکەوە دەست ئەکەن بە یارمەتیو کۆمەك کردنی یەکتری لەسەر کردەوەی چاكو بەنرخ، وە خراپەکارانیش شەرم ئەیانگرێ کە زیاتر لە خراپەکاریدا بچنە خوارەوەو خۆیان بخنکێنن، وە هەروەها لە نێوان دەسەڵاتدارو ساماندارەکاندا هەستی خۆشەویستیو یارمەتی بۆ برا هەژارەکانیان پەیدا ئەبێو زیاتر پەرەئەسێنی و بەهێزتر ئەبێ، بۆیە دەست ئەدەنە بەخشینی زۆر لە سامانەکانیان لە رێگای خوادا، بەشێوەیە کە باری ژیانی موسوڵمان لەیەك نزیك ئەبێتەوە، وە ئەمانەیش هەموو ئەم هەستەیان تێدا بتەو ئەکا کە یەك هێزو یەك کۆمەڵن، دیارە ئەمەیش هۆیەکی زۆر تەواوە بۆ ئەوەی کە یەکتریان خۆش بوێو برایەتیو بەزەییو یەکێتیان بتەو و تونتر بێ. ئەم کەڵكو سوودانەش بێگومان هەمووی بۆ خۆمان ئەگەرێتەوە، وە خوای گەورە هیچ پێویستیەکی بەوە نییە کە برسیو تێنوومان بکات، وە رۆژووی

ئەم مانگەی بۆ سوودو قازانجی خۆمان پێویست کردووەو لەسەرمانی دیاری کردووە، کەواتە ئەوانەی ئەم رۆژە ناگرن بەبێ هۆیەکی گونجاو ئەوانە تاوان لە خۆیان ئەکەن، بەڵام تاوانبار ترو خراپترینیان ئەوانەن کە لە مانگی رەمەزاندا هیچ شەرم نایانگرێ‌و بە ئاشکرا لەناو مەردمدا دەست ئەکەن بە خواردن‌و خواردنەوە، وەك ئەوە وایە پڕ بە دەمیان بانگ بکەن: ئێمە لە کۆمەڵی موسوڵمان نین و بە هیچ شێوەیە گوێ نادەینە فەرمانی ئایینەکەیان، بەڵکو لەوانەین کە زۆر بەئاسانی ئەتوانین لە کۆمەڵی موسوڵمان دەرچین، وە هەروەها شەرم ناکەن لەوەی کە لەیاساو سنووری ئەو کەسە دەرچن کە دروستی کردوون‌و خاوەنیانەو بەخێویان ئەکات، وە لەلایان زۆر ئاسانە کە پێچەوانەی یاساو پرۆگرامی پێشەوای گەورەیان (محمدﷺ) بجوڵێنەوە و رەفتار بکەن.
کەواتە ئەمانە چۆن هیوای دەست پاکی و کردەوەی باش‌و هەست بەلێپرسینەوەیان لێ ئەکرێ؟ وە چۆن پارێزگاری یاساو بەرنامەو رەوشتی جوان ئەکەن ؟!.

## زەکات

پایەی سێیەم لە پایەکانی ئاینی ئیسلام (زەکات)ە، خوای پەروەردگار پێویستی کردووە لەسەر هەموو ئەندامێ لە ئەندامانی کۆمەڵی ئیسلام کە هەر کاتێ سامانی گەیشتە رادەی زەکات، وە ساڵی بەسەردا هاتووە پێویستە زەکاتی بدا بەیەکێ لەو هەشت پۆلەی کەلە قورئانی پیرۆزدا دیاری کراون.
ئابەم شێوەیە خوای پەروەردگار بەشێکی دیاریی لە ماڵی ساماندارو خاوەن دەسەڵاتەکان بڕیوەتەوە بۆ هەژارو لێقەوماوان، کە رێژەکەی ئەکاتە (٢,٥٪) لە هەموو جۆرە ماڵێکدا، وە ئەگەر یەکێ لەوە زیاتر بدات بە ئارەزووی خۆی ئەوە چاکترەو پاداشتی گەورەترە.
وە ئەم بەشە دیاریکراوە بۆ ئەوە دانەنراوە کە خوا پێویستی‌یەتی‌و بگا

بەخۆی، بەلاّم بەبەندەکانی ئەفەرموێ هەرکاتێ ئێوە شتێکتان دا بە برا هەژارەکانتان لەبەر منو چونکە من پێم خۆشەو، وە بە خۆشی خۆتانو دڵفراوانیەوە بێ ئەوەی ئازاری براکەتان بدەن، وەیان ئازی بەسەردابکەن وەیا بەسووکی سەیری بکەن، یا بە هیوای بن پاداشتان بداتەوە، یان سوپاستان بکات، ئەوە ئەو چاکەیەتان لەگەڵ من کردووە، جا ئەگەر ئەو بەشەی کە خوا لە ماڵی ئێوە بۆ هەژارەکانی داناوە جیاتان کردەوەو پێتان گەیاندن، وە دڵیشتان پاك بوو لەم جۆرە نیازە چەپەڵو نزمانە ئەوا منیش لەو ماڵە زۆر گەورەیە کە هەمە بەشێکی واتان دەدەمێ کە هەرگیزاو هەرگیز نابڕێتەوەو تەواو نابێ.

خوای پەروەردگار هەر چۆنێ نوێژ و ڕۆژووی لەسەر پێویست کردووین، هەروەهاش ئەم زەکاتەی لەسەر داناوین کە ئەمیش پایەیەکی گرنگو کۆڵەکەیەکی بەهێزە لە خانووی ژیانی ئیسلامیدا، چونکە موسوڵمانەکان ئەڕازێنێتەوە بە ڕەوشتو ئاوەڵناوی خۆبەختکردنو سوودو قازانج ویستنی مەردم، وە ڕەزیلیو پیسکەییو دڵ ڕەقیو ماڵ پەرستیو ئەم جۆرە خووە خراپانە لە مرۆڤدا ئەسڕێتەوەو پاکی ئەکاتەوە، هیچ کاتێ ئاینی ئیسلام مرۆڤی پیسکەو ماڵ پەرستی ناوێ، چونکە ئەم جۆرە مرۆڤانە سوودیان بۆ ئیسلام نییە نەکەم و نەزۆر، وە مرۆڤی وا هەرگیز ڕوو لە ئیسلام ناکاو بەرێبازە ڕاستەکەیا ناڕوا، بەلاّم ئیسلام یەکێکی ئەوێ هەرکاتێ فەرمانێکی خوای هاتە سەر بە گیانو ماڵ قوربانی ئەدا لە ڕێگەیدا بێئەوەی بە هیوای بچووکترین مەبەستی تایبەتی خۆی بێ، زەکات مرۆڤی موسوڵمان ڕائەهێنێ لەسەر ئەم قوربانی و خۆبەختکردنە، وای لێ ئەکا لە کاتی تەنگانەو پێویستیدا خۆی نەمریکێنێ بەسەر ماڵەکەی داو بەهیچ شێوەیە تۆزی لێ نەبێتەوە، بەڵکو پڕبەدڵو بەخۆشی خۆی دەست ئەداتە خەرج کردنو تەنگانەو پێویستییەکە چارەسەر ئەکات.

وەیەکێکی تر لە سوودو کەڵکی زەکات ئەوەیە کە موسوڵمانەکان یارمەتیو

کۆمەکی یەك ئەکەن هەتا برسیی و هەژاری و رووتییان نامێنێ، وە دەسەڵاتداریان خۆی ناگرێ لە یارمەتی هەژارو بێدەسەڵاتیان، هەژاریشیان نایەوێ دەستی هەژاری درێژ بکا بۆلای ساماندار، وە هیچیان ماڵی خۆی لە شتی بێهوودە و پڕوپووچدا خەرج ناکات، چونکە زۆر باش تێئەگات و ئەزانێ ئەوەی کەلایەتی مافی هەتیوو هەژارو بێوەژن و لێقەوماوانی پێوەیە، هەروەها ئەزانێ هەندێ کەس هەن کە توانای ئیشکردنیان هەیە، بەڵام توانای کڕینی کەرەستەو کەلوپەل و هۆی ئیشەکەیان نییە، ئەمانەیش ماف و بەشیان هەیە لەو ماڵەی ئەودا، وە ئەزانێ ئەو قوتابیانەی کە وریاو زیرەکن و ئەتوانن زیاتر بخوێنن و زانیاری باشتر وبەکەڵك و سوودتر وەرگرن، بەڵام لەبەر بێ دەرامەتی ناتوانن درێژە بە خوێندنەکەیان بدەن، ئەم قوتابیانەش مافیان هەیە لەو ماڵ و سامانەی ئەودا، وە ئەو لێقەوماوو پەککەوتووانەیش کە ناتوانن. بە هیچ شێوەیە. ئیش بکەن ئەوانیش ماف و بەشیان لەو ماڵەدا هەیە، هەر دەوڵەمەندێ کە دان نانێ بەم مافانە بەسەریەوە ئەوە تاوانبارو ستەمکار(ظالم)ە.

چ تاوانێ گەورەترە لەوەی کە تۆ لە کۆشکەکەی خۆتا رابوێری و هەموو هۆیەکی ژیانت لەدەورت کۆکردبێتەوەو بەسواری ئۆتۆمبێل نەبێ هەنگاوێ نانێیتەوە بەرپێی خۆت، کەچی ئەم لاو ئەولات پڕە لە هەژارو لێقەوماوو دەست کورت، هی وایان تێدایە پارچە نانێکی وشکی دەست ناکەوێ، وە هەزارانی وایان تێدایە کە توانای ئیشکردنی هەیەو بەسەر دەما کەوتووەو ئیشی دەست ناکەوێ بەراستی ئایینی ئیسلام ئەم جۆرە مرۆڤەی خۆش ناوێ، وەئەم ماڵ خۆشویستن و رەزیلی و بۆ خۆویستنە بەرەوشت و خوی خوانەناسەکان دائەنێ، ئەوانەی کە شارستانییەکەیان وایان پێئەڵێ: هەرچی دەستیان بیگاتی لە ماڵ و سامان بۆ خۆیانی کۆبکەنەوەو سووخۆری پێوە بکەن و بەم هۆیە ئەو سامانەی کەلەدەستی کەسانی تردایە رای بکێشن بۆخۆیان. بەڵام

موسـولْمانەكان ئاييندكـەيان ئـەوەيان پێ ئـەڵێ: ئەگـەر هـەرچی زيـا بـوو لـە پێويـستيی خۆيـان نابێ كۆیبكەنـەوەو هـەڵیگرن‌و سووخۆری پێـوە بكـەن، وە پێويسته بیدەن بەو برايانەيان كە ماڵیان نی‌يە بۆ ئەوەی پێويستی خۆيانی پێ جێبەجێبكـەن تـا ئـەوانيش بتوانـن ئيش‌وكـار بكـەن‌و هـۆی ژيانيـان دەسـت بكەوێ.

## حـەج

پايەی چوارەم لە پايەكانی قەڵای ئيسلام (حەج) كردنە، خوای پەروەردگار ئەم سەفەرو رۆشتنەی تەنها لەسەر ئەوانە پێويست كردووە كە توانای رۆشتن‌و هاتنەوەيان هەيە. وەلەتەمەندا يەك جار پێويست كراوە.

ئيـبراهيم پێغەمبــەر (عليه السلام) هــەزاران ســاڵ لەمــەوپێش مــاڵێكی بچكۆلــەی دروستكردووە بۆ خواپەرستی لە شوێنێكا لەشاری (مەككە)ی پيرۆزی لێيە، وە خوای گـەورە ئـەم هـەوڵدان‌و سـوپاس‌و دڵسـۆزی‌و خۆشەويسـتيەی ئيـبراهيم پێغەمبـەری قبـوڵ كـردووە بەشـێوەيە ماڵەكـەی بـە مـاڵی خـۆی دانـاوە، وە فەرمووبـەتی كە هەركەسێ ئەيەوێ من بپەرسـتێ بـا لـەكاتی پەرسـتنی منـدا رووبكاتە ئەم ماڵە، وەهەركەسيش ئـەتوانێ بێـت بۆلای با لەتەمـەنيدا بەلايـەنی كەمـەوە يـەك جار بێـت بۆئـەوەی بـەدەوريدا بسـوڕێتەوە، بـەڵام لەگـەڵ وێنـەی خۆشەويستی و دڵسۆزيەكەی ئيبراهيم پێغەمبـەر كەلەگـەڵيا ئەسوڕايەوەو منی ئەپەرسـت، هـەروەها خـوای گـەورە فـەرمانی داوە هـەركاتێ مـاڵی خۆتـان بەجێهێشت‌و نيـازی ئـەم ماڵـەتان كـرد ئـەبێ دەروونتـان پـاك بكەنـەوەو حـەزو ئـارەزووی ناپەسـەند لـەغاو بكـەن‌و خۆتـان لـە خراپـەكردن‌و دەمـەقرەو خوێـن رشتن‌و قسەی پڕوپووچ و بێكەڵك بپارێزن، وەبەو شێوەيە كە پێويسـت كـراوە وەرن بۆلای لەگەڵ ياسای رێزگرتن و لەسەرخۆيی و ئارام، وە بزانن ئێوە بۆلای پاشايەكی گەورەو بەدەسەلات ئەڕۆن كە زەوی‌و ئاسمانەكان هی ئەون‌و بەهێزو

توانای ئەو راگیرکراون، ئەو کەسەی کە پێویستی بەکەس نیەو هەموو کەس پێویستی بەئەو هەیە، وە ئەوەیش بزانن ئەگەر ئێوە بەم جۆرە هاتن بۆلای منو لەبەر دەستی ئێمەدا خۆتان ئامادەکردو ئەو پەرستنانەی کە لەسەرمان داناون بە دڵێکی خاوێنو پاكو بێگەردەوە جێبەجێکرد، ئەوا ئێمەیش لە پاشەڕۆژدا لەلای خۆمانەوە جوانترین پاداشتان ئەدەینەوە.

ئەگەر لە روویەکی ترەوە تەماشای حەج بکەی ئەزانی کەوا لە هەموو پەرستنێ گەورەترو رێزی زیاترە. ئەگەر یەکێ خۆشەویستی خوا لە دڵیا نەبێ بۆچی بازرگانیو ئیشو کارو ماڵو منداڵو هاوەڵو دۆستانی بەجێدێڵێو خۆی تووشی گیروگرفتو ناخۆشی ئەم رێگا دوورو دژوارە ئەکات؟ تەنها نیازکردنی ماڵی خوا بەڵگەیە بۆ دڵسۆزی وخۆشەویستی خوای پەروەردگار، سەرەڕای ئەوەیش ئادەمیزاد کاتێ دەرئەچێ لەماڵ و دەست ئەکا بە رۆشتن بۆ ماڵی خوا نیازو هەستی بۆخوایەو لەگەڵ خوادایە، لەبەر ئەوە سات لە دوای سات هەستی دڵسۆزیو خۆشەویستی زیاد ئەکاتو بەهێزتر ئەبێ، هەرچەندە رێگاکەی دووربێو هەست بە نزیك بوونەوەی مزگەوتی (کەعبە) بکات خۆشەویستی زیاتر ئەکاو دڵی لە گوناه وخراپەکاری دوورتر ئەکەوێتەوە، وەلە گوناه و خراپە کۆنەکانی پەشیمان ئەبێتەوەو شەرم ئەیگرێ، وە بەم هەستەوە لە خوا ئەپاڕێتەوەو داوا ئەکات کە لەمەولا تەمەنی زیاتر یارمەتی بدات بۆ خواپەرستیو پەیرەوی فەرمانەکانی، هەروەها وردە وردە هەست بە خۆشیو شادیەکی زۆر ئەکا لە یادی خواو پەرستنیدا، بۆیە لە هەموو کڕنووشێکدا حەزئەکا درەنگ سەرهەڵبڕێو پێی خۆشە کە هەمیشە لە کڕنووشدا بێ بۆی، هەروەها کە قورئان ئەخوێنێ ئەبینێ جیاوازیەکی زۆر گەورە هەیە لە نێوان ئەم خۆشیو شادیە کە ئێستا هەستی پیئەکاو ئەو خۆشیو شادیەی کە ئەوسا هەستی پێئەکرد. وە کە رۆژوو ئەگرێ هەست بە شیرینیەك ئەکا کە هەرگیز هەستی پێنەکردبێ، دوای ئەوە کە ئەگاتە خاکی (حیجاز) لەوێدا مێژووی

ئیسلامی لە قۆناغی یەکەمدا دێتە بەرچاو، وە هەموو پارچەیەك لەو پارچە زەویانەی ئەوانەی بەرچاو ئەکەوێ کە خوا لێیان رازی بووەو ئەوانیش لە خوا رازی بوون، وە خوایان خۆشویستووەو ئەویش ئەوانی خۆشویستووە، وەهەر ئەوان بوون کە گیان و سامانیان بەسەر لەپی دەستیانەوە بووە بۆ ئەوەی بیکەن بە قوربانی لە پێناوی گەیاندن و بڵاوکردنەوەی ئایینی خوادا، وە هەموو دەنکە تۆز و لمێك شایەتی گەورەیی و مەزنی ئەم ئایینە ئەدا، وە هەموو پیچەکە بەردێکیش بەزمانی حاڵ رەوانتر لە قاڵ، هاوار ئەکاو ئەڵێ: ئەم زەویە پیرۆزە بوو کە ئایینی ئیسلامی تێدا دەرکەوت و لێرەوە رۆژی رووناکیی هەڵهات و تەواوی زەوی رووناك کردەوە..

ئابەم شێوەیە دڵی موسوڵمان پڕ ئەبێ لە خۆشەویستی خواو ئایینەکەی، بۆیە لە کاتێکا کە ئەگەڕێتەوە بۆنیشتمانی خۆی ئەبینێ ئاینی ئیسلام کارێکی وای کردووە لە دەروونیدا کە بەدرێژایی تەمەنی ناتوێتەوەو لە دڵی دەرناچێ، وە حەج سوودو کەڵکی تری زۆری تێدایە، یەکێ لەو سوودو کەڵکانە ئەوەیە کە خوا ئەم شارە پیرۆزەی کردووە بەبنکەی موسوڵمانەکان لە هەموو لایەکەوە دڵیان بۆی لێ ئەدا، لەگەڵ ئەم جیاوازی رەنگ و زمان و نیشتمانەدا، وەبەجارێ هەست دەکەن کە هەموویان برای یەکن و بە هەموویانەوە گەل(ئوممەت)ێکیان پێك هێناوە کەبە نەتەوەی ئیسلام ناو ئەبرێ.

حەج لەلایەکەوە خواپەرستی‌یە، وەلەلایەکی تریشەوە کۆنگرەیەکی ساڵانەیە کەلە هەموو ناوچەیە لە ناوچەکانی وڵاتی ئیسلامەوە نوێنەرانی تیا بەشدار ئەبێ. بۆیە گەورەترین و باشترین هۆیە بۆ پێگەیاندن و گەشەکردنی برایەتیەکی ئیسلامی لە هەموو جیهاندا لەسەر بنچینەی یەکێتی و خۆشەویستی و یارمەتی.

## پـاراسـتـنـی ئـیـسـلام

پێنجەم شتێ کە خوای پەروەردگار پێویستی کردووە لەسەر بەندەکانی، بریتی‌یە لە پاراستنی ئیسلام، وەئەم پاراستنەش هەرچەند دامان نەناوە بە پارچەیەك لە پایەکانی ئیسلام، زۆر جار لە قورئان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەردا ناوی هێنراوەو بە گرنگی باسکراوە.

بابزانین پاراستنی ئیسلام کامەیە؟ وە بۆچی خوای پەروەردگار پێویستی کردووە لەسەر موسوڵمان؟

نمونەیەکت بۆ بهێنمەوە کە لەوانەیە لەو نمونەیەوە ئەمەت بۆ روون ببێتەوە، گریمان پیاوێك هەیە پێت ئەڵێ من هاورێی تۆم‌و زۆرم خۆش ئەوی، بەڵام لە کاتێکا کە تووشی لێقەومانێ بووی، یان تەنگانەیەك رێگای گرتی ئەبینی کردەوەو هەڵوێستی وا پیشان ئەدا کە بەهیچ شێوەیە تۆی خۆش ناوێ و گوێ‌ناداتە ئەو گیروگرفتەی کە تووشی بووی، وە بە بیریدا نایەت‌و لای گرنگ نی‌یە تووشی زیان یان قازانج ببی، وەلەبەر سوودی تایبەتی خۆی دڵگران نابێ‌و گوێ نادا بەو ناخۆشی‌و ئازارەی کە تووشی تۆبووە، وە دانیشتووەو دەستی کێشاوەتەوە لە هەموو ئیشێ کە سوودو قازانجی تۆی تێدابێ، چونکە سوودو قازانجی خۆی تێدا نابینێ، وەدەستی یارمەتیت بۆ درێژ ناکاو هەوڵی سەرکەوتن‌و بەرزی تۆ نادات، بەڵکو بەشداری‌و هاوەڵی ئەو کەسانە ئەکات کە بەخراپە ناوی تۆ ئەبەن‌و درۆو دەلەسەت بۆ هەڵئەبەستن‌و ئەویش زیاتر هانیان ئەدات، وەیا بەلایەنی کەمەوە بێدەنگ ئەبێ‌و هەوڵ نادات کە بیانگێڕێتەوە لەو درۆو پڕوپاڵانتەیەی کە بۆت هەڵئەبەستن‌و بڵاوی ئەکەنەوە، وە هەروەها یارمەتی دوژمنەکانت ئەدات لە کاتێکدا کە پیلانت بۆ رێك ئەخەن، بەلانی کەمەوە هەوڵ نادات کە نەکەویتە ناو پیلان‌و تەڵەو کەمینی ئەوانەوە..

ئایا تۆ هەروا ئەزانیت کە ئەم پیاوە راستگۆیە لەگەڵتداو راست ئەکا تۆی

خۆش ئەوێ‌و لەم داوایەی‌دا بڕوای پێ‌ئەکەی؟

بێگومان نەخێر، چونکە ئەمە بەزمانی خۆشەویستی تۆ دەرئەبڕێ بەلاّم لەراستیداو لەناوی دڵەوە خۆشی ناوێت، چونکە مانای دۆستایەتی‌و خۆشەویستی ئەوەیە کە مرۆڤ هاوەڵی خۆی خۆش بوێ لە دڵەوەو دڵسۆز بێ بۆی، وەلە خۆشی‌و ناخۆشیدا بەشداری بکاو یارمەتی بدات بەسەر دوژمنەکانیدا، وە پێی خۆش نەبێ کە یەکێ بە خراپی ناوی ببا، هەر پیاوێ ئەمانەی تێدا نەبێ ئەوە دووڕوو(منافق)ە لە داواکەیدا درۆ ئەکات، تۆیش کە ئەڵێی من موسوڵمانم‌و ئاینی ئیسلامم خۆش ئەوێ لەگەل ئەم نمونەیەدا خۆت بەراورد بکە، چونکە ئەم قسەیەت وا ئەگەیەنێ کە پێویستە ئازایی موسوڵمانیت تێدا بێ‌و بەجەرگ بی بۆ پاراستنی بڕواو ئاینەکەت، وە ئەبێ بەڕاستی ئەم ئایینەت خۆش بوێ‌و لەگەڵ برا موسوڵمانەکانتا راست‌و رێك‌و پێك بیت، وە هەر ئیشێ بکەی لەم جیهانەدا ئەبێ چاکەو سوودو قازانجی موسوڵمانەکان لەبەر چاوی خۆت دابنێی، وە هەرگیز کارو کردەوەیە نەکەی کە زیان بگەیەنێ بە ئاینی ئیسلام‌و پێچەوانەی فەرمان‌و مەبەستەکانی ئەو بێ، هەر لەبەر ئەوەی کە خۆت سوودێکی تایبەتت دەست بکەوێ، یا لە گیروگرفتێ بپەرێیتەوە، وەهەروەها پێویستە لەسەرت کە بە گیان‌و سامان بەشداری بکەی لە هەموو شتێکا کە چاکەی ئیسلام‌و موسوڵمانانی تێدابێ، وە ئەبێ دووربکەویتەوە لەهەر شتێ یان کردارو رەفتارێ کە زیانی ئیسلام‌و موسوڵمانانی تێدا بێ، وە لە سەربەرزیی ئیسلامدا نەبێ خۆت بەسەربەرز نەزانی، وە ئارام نەگری لەسەر نزمی‌و بێ‌هێزی ئیسلام‌و موسوڵمانان، وە یارمەتی دوژمنی ئیسلام‌و موسوڵمانان نەدەی هەرچۆنی یارمەتی دوژمنی خۆت نادەی، وە ئەبێ ئامادە بیت بۆ هەموو قوربانی‌و خۆبەخت کردنێك لە پێناوی ئاینی ئیسلام‌و پاراستنی موسوڵماناندا هەروەکو ئامادەی بۆ هەموو جۆرە قوربانیەك بۆ پاراستنی خۆت.

ئا بەم جۆرە، ئەو کەسەی ئەڵێ: من موسوڵمانم پێویستە ئەم ئازایی و ڕەوشتانەی هەموو تێدابێ، دەنا ئەوە موسوڵمانی تەواو نی یە و بە دووڕوو(مونافق) دائەنرێ، چونکە هەموو کردەوەو هەڵوێستەکانی هاوار ئەکەن و شایەتی ئەدەن: کە ئەم داوایەی بە زمان ئەیڵێت درۆ ئەکات، وە تێکۆشان و هەوڵدانی تەواو لە ڕێگای خوادا (الجهاد في سبيل الله) بەشێکە لە پاراستنی ئیسلام، چونکە وشەی (الجهاد) لە زمانی عەرەبیدا واتە تەواوکردنی هەموو هەوڵدان و کۆششێ، وە بەکارهێنانی هەموو تواناو هێزێ لە ئیشێکدا، کەواتە هەرکەسێ تێبکۆشێ بۆ بەرزکردنەوەی (وتەی ئیسلام) بەوەی کە هەیەتی لە سامان و گیان و پێنووس و زمان ئەوە ئەو کەسەیە کە تێ ئەکۆشێ لە ڕێگای خوادا بەمانای گشتی تێکۆشان (الجهاد)، بەڵام ئەو وشەیە مانایەکی تایبەتیشی هەیە کە بریتی یە لە جەنگ کردن و کوشتار کە موسوڵمانان پێی هەڵئەسن بەرامبەر بە دوژمنانی ئیسلام، هیچ هۆیەك نی یە جگە لەبەر خواو پاراستنی ئاینی ئیسلام، وە خۆیان هیچ مەبەستێکی تایبەتیان نی یە، ئەم تێکۆشانە بەم مانایە لەبەرنامەی ئیسلامدا پێی ئەوترێ (فرض الكفاية)، واتە پێویستێکە هەرچەند گوناهو تاوانی جێبەجێ نەکردنی ئەگەڕێتەوەو بۆ هەموو موسوڵمانان، بەڵام ئەگەر کۆمەڵێکی تایبەتی ئەم پێویستەیان جێبەجێ کرد لەباتی ئەوان و پێویستی بەکەسی تر نەما ئەوە گوناهەکەی لەسەر هەموویان لائەچێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر دوژمن هەندێ لە وڵاتی ئیسلامی داگیر کردبوو وە پێویستی بە هەموو کەس دەکرد کە تێبکۆشن بۆ ڕزگارکردنی، ئەوا ئەو کاتە دەبێتە (فرض العين) واتە پێویستێکە کە ئەبێ هەموو موسوڵمانێ پێی هەڵسێ وەکو نوێژ و ڕۆژوو بۆ ڕزگارکردنی.

ئینجا ئەگەر موسوڵمانی ئەو ناوچەیە نەیانتوانی بەرهەڵستی هێرشەکە بکەن، پێویستە لەسەر هەموو یەکێ لە موسوڵمانانی ناوچەکانی تر ئەوانەی کە نزیکن پێویستە بە گیان و سامان یارمەتیان بدەن، ئەگەر دوای یارمەتی

ئەوانیش دوژمنەکە هەر نەشکا ئەوا یارمەتیدانەکە ئەبێ بە (فرض العین) لەسەر هەموو موسولْمانان، واتە پێویست ئەبێ لەسەر هەموو کەسێ کە موسولْمان بێ لەهەر وڵاتێك بێ کە یارمەتی ئەو موسولْمانانە بدەن کە دوژمن هێرشی هێناوەتە سەریان، هەروەکو نوێژ و رۆژوو بەشێوەیەك کە هەرکەسێ خۆی بگرێ بە زەویداو یارمەتیان نەدا گوناهبار ئەبێ، وەلەم جۆرە کاتانەدا تێکۆشان (الجهاد فی سبیل الله) گرنگی زیاترو گەورەترە لە نوێژ و رۆژوو، چونکە بڕوای مرۆڤ لە تێکۆشاندا تاقی ئەکرێتەوەو راستی و ناڕاستی دەرئەکەوی، کەواتە ئەو کەسەی کە یارمەتی ئیسلام نادات و لەگەڵ موسولْمانا تێناکۆشێ هەتا لە کاتی تەنگانەو ناخۆشیشدا، ئەوە گومان هەیە لە بڕوایداو لەوانەیە موسولْمان نەبێ، ئینجا چ کەڵکێ هەیە لە نوێژوو رۆژووەکەیدا، خۆ ئەو موسولْمانەی کە دوژمنایەتی ئەکات لەگەڵ ئیسلامداو دوژمنانی ئیسلام فێرو شارەزا ئەکا بە وڵاتی ئیسلام، ئەوا خراپترین کەسێکە گومان نییە لەوەدا کە دووڕوو(منافق)ە، نوێژ و رۆژوو زەکات و حەجەکانی بەتەواوی تواونەتەوەو کەڵك و سوودیان لێ وەرناگرێ.

## بەشی شەشەم

# ئایین و بەرنامە
# (الدين والشريعة)

* جیاوازی لە نێوان ئایین و بەرنامەدا.
* ئەو هۆیانەی کە بڕیارو فەرمانەکانی بەرنامەیان پێئەناسرێن.
* لێوەرگرتن (الفقه).
* صۆفیەتی (التصوف).

*ئەوەی کە بۆمان باسکردی لەبەشەکانی پێشوودا هەموو لە بارەی ئایینەوە بوو، ئێستا ئەمانەوێ لەبابەت بەرنامە(شریعة)ی پێغەمبەرمان (محمد)ەوەﷺ شتێکت بۆ باس بکەین، بەڵام بەر لە هەموو شتێ بە پێویستی ئەزانم کە بزانی جیاوازی چی‌یە لە نێوانی ئایین و بەرنامەدا.*

## جیاوازی لە نێوان ئایین و بەرنامەدا

لەمەوپێش باسمان کرد کە هەموو ئەو پێغەمبەرانەی کە خوا ناردوونی ئەوانیش ئایینی ئیسلامیان بەمەردم گەیاندووە، ئەویش بریتی‌یە لەوەی کە تۆ بڕوات ببێ بە خوای پەروەردگار و ئاوەڵناوەکانی، وە بە ڕۆژی دوایی و بەو شێوەیە کە پێغەمبەران ڕابەری مەردمیان کردووەو پێیان ڕاگەیاندوون، وە پێویستە بڕوات ببێ بە پەڕاوەکانی خوا، وە شوێنی هیچ ڕێبازێ نەکەوی جگە ئەو ڕێبازە ڕاستە کە ئەم پەڕاوانە باسیان کردووەو دیاریان کردووە، وەئەبێ تەنها شوێنی ئەو پێغەمبەرە ڕاستگۆیانە بکەوی و شوێنی کەسی‌تر نەکەوی، وە بڕوات بە تەنیایی خوا بێ و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەی لە پەرستندا[9].

وە دوای ئەم ئاینە شتێکی تر هەیە پێی ئەڵێن بەرنامە(الشريعة) واتە ڕێگای خواپەرستی و بنەڕەتەکانی ژیان و کۆمەڵایەتی، هەروەها یاساو ڕژێمی نێوان مەردم لە بابەت کڕین و فرۆشتن و سنووری جیاکردنەوەی حەڵاڵ و حەرام و پەیوەندیەکانی تر. خوای پەروەردگار لە سەرەتاوە هەندێ بەرنامەی جیاجیاو جۆربەجۆری نارد بۆ پێغەمبەرەکانی بەپێی جیاوازی بارو چۆنیەتی ئەو گەل و

---

[9] هەموو جارێ ئەڵێین لە پەرستندا چونکە ئەوەی کە جێگای لێکۆڵینەوەیە بەشداری پەرستنە، ئەگینا دیارو ئاشکرایە کەلە دەسەڵات و دروستکردندا هاوەڵی نی‌یە، نابینی لە شایەتمانا ئەڵێین: (لا اله الا الله) نەمان وتووە (لا خالق الا الله) چونکە هەزار جار بڵێی: دروستکەر نی‌یە خوا نەبێ هێشتا شایەتمانەکەمان تەواو نییە، بۆیە شایەتمان وە موسوڵمان بوون بەمە تەواو نابێ. بەڵکو پێویستی بەوە هەیە کە بزانین پەرستراو هەر ئەو خوا بەدەسەڵات و زانایەیە کە هەموو کەس ئەزانێ هەر ئەو توانای دروستکردنی هەیە و کەسی‌تر لە دەستی نایە. (وەرگێڕان)

نەتەوە جیاجیانە کە بۆیان ئەنێرران، لە هەموو کاتو چەرخێکدا بۆ ئەوەی هەموو یەکێ لەم گەلو نەتەوانە پەروەردە بکرێنو رابهێنرێن لەسەر رەوشتو ژیریی‌و کۆمەڵایەتی‌و شارستانیەتی، وە هەمویان ئامادەبکرێن بۆ پەیڕەوی کردنی (رژێمێکی گشتی‌و هەمیشەیی) کە لەلایەن خواوە بنێررێ، وەکاتێك کە ئەم کارە لەسەر دەستی پێغەمبەرە پێشووەکان تەواو کرا، ئینجا لە کۆتایی هەموویاندا خوای گەورە پێغەمبەرمان (محمدﷺ)ی نارد بەم یاساو بەرنامە گشتی‌و هەمیشەییەوەو بەرنامەو یاسایەکی وا کە بەندەکانی وا داڕێژراون کە بۆ هەموو جیهان شیاو بێ‌و دەست بدات هەتا رۆژی دوایی، کەواتە ئایین لە ئێستادا هەر ئەو ئایینەیە کە پێغەمبەرە پێشوەکان هێناویانەو مەردمیان بۆ بانگکردووە، بەڵام بەرنامەکانیان سڕاونەتەوەو لە جێگای ئەو بەرنامە جیاوازانەدا یەك بەرنامەی تەواو دانراوە کە لە رێگاکانی خواپەرستی‌و بەشەکانی ژیان‌و رژێمی نێوان بەندەکان‌و سنووری حەڵاڵ‌و حەرام لەم تاقە بەرنامەیەدا جیاوازی تێدا نی‌یە، وە بۆ هەموو مەردم لە هەموو جیهاندا یەکسانە هەتا رۆژی دوایی

## ئەو هۆیانەی کە بڕیارو فەرمانەکانی بەرنامەیان پێ ئەناسرێن

دوو هۆی گرنگمان بە دەستەوەیە بۆ ئەوەی سەرەتاییەکانی بەرنامەی پێغەمبەرمان (محمد)ی پێ‌بدۆزینەوەو بڕیارو فەرمانەکانی پێ بناسین:

یەکێکیان قورئانی پیرۆزە، کە فەرموودەی خوایەو هەموو رستەو وشەیەکی لەلایەن خواوە هاتووە، ئەویتریان ئەو رێگایەیە کە پێغەمبەرﷺ لە ژیانی خۆیدا پیا رۆشتووە، کە بەعەرەبی پێی دەوترێ (السنة) واتە رەوشتو چۆنیەتی ژیانی پێغەمبەر. وە لێرەدا مەبەستمان ئەو باس‌و فەرموودانەی کە لە پێغەمبەرەوە گێڕراوەتەوە، چونکە بەڕاستی ژیانی پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتاوە هەتا دوایی بریتی‌بووە لە لێکۆڵینەوەو روونکردنەوەی مەبەستەکانی قورئانی پیرۆز، هەر لەو

کاتەوە کەبووە بە پێغەمبەرو خوای گەورە پەیامی بۆناردووە هەمیشە خەریکی فێرکردنی مەردمو شارەزاکردنیان بووە بۆ ئەوە رێگایە کە خوا پێی خۆش بێ و ژیانی خۆیان بەو شێوەیە بەسەر بەرن، ئەم خەریك بوونەش ماوەی (٢٣) ساڵی رەبەق بووە، لەم ماوەیەدا کە ماوەیەکی کەم نی یە هاوەڵەکان چ پیاوان و چ ئافرەتان، هەروەها خزمە نزیکەکانی، هاوسەرە پاك و خاوێنەکانی، ئەمانە هەموویان زۆر بە پەرشەوە گوێیان لە فەرموودەکانی گرتوەو بەدوای کردەوەکانیدا رۆشتوون، وە لە هەموو ئیش وکارێکداو لە هەموو پەیوەندی و چۆنیەتیەکی ژیاندا پرسیان پێ کردووە و ئەویش هەموو هەنگاوو هەڵوێستێکی بۆ روون کردوونەتەوە، هەندێ شتی لێ قەدەغەکردوون و فەرمانی هەندێکی تری داوە کە بیکەن، ئەوانەی کەلەوێ بوون ئەم بڕیارو فەرمانەیان گەیاندووە بەوانەی کەلەوێ نەبوون، وە ئەگەر ئیشێکی تایبەتی کردبێ ئەوانەی کە لەوێ ئامادەبوون هەڵیانگرتووە و گەیاندویانە بەوانەی کەلەوێ نەبوون، یان ئەگەر یەکێ لە هاوەڵەکانی لای خۆیدا ئیشێکی کردبێ بێ دەنگ بووە یان قەدەغەی کردووە، وە مەردمیش ئەم شتانەیان هەڵگرتووەو پارێزگاریان کردووە، ئینجا چینی دوایی هەرچیان ئەبیست کە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ئەیانگێڕایەوە هەمویان پارێزگاری ئەکردو هەڵیان ئەگرت تا هەموو فەرموودەکانیان لەناو چەند پەڕاوێکدا نووسی و کۆکردەوەو لەگەڵ خۆیان ناوی ئەوانەی کە فەرموودەکانیان گێڕاوەتەوە کە ئەوانیش هاوەڵی خۆی بوون لەگەڵ خۆی ژیاون بە شێوەیە لەناو مەردمدا کۆمەڵە پەڕاوێك ئامادە بوو هەموو لەبابەت فەرموودەو کردەوەکانی پێغەمبەرەوە بوون، کە بەناوبانگترین ئەم پەڕاوانەو ئەوانیان کە زیاتر جێگای بڕوا بن ئەوانەن کە پێشەوایانی بەرێز مامۆستایان (بخاری، مسلم، مالك، ترمذی، ابو داود، ابن ماجه، نسائی) خوا لێیان خۆش بێ کۆیان کردووەتەوە.

## لـێوەرگرتن (الفقه)

کۆمەڵێ لە پێشەوا گەورەکانی موسوڵمانان زۆر بەجوانی سەیری بڕیارو فەرمانەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەریان کرد، وەلەسەر ئەوەوە ئەو یاساو دەستورەی کە ئێستا بە درێژی لە پەڕاوەکاندا باس کراوە داناو ڕێکیان خست بۆ ئەوەی موسوڵمانان بە ئاسانی بڕیارو فەرمانەکانی خوای گەورە بناسن وە ئەم یاساو دەستورانەی کە لە فەرمانەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەرمان محمدﷺ وەرگیراون ئەوەیە کە ناو ئەبرێ بە (الفقه) واتە تێگەیشتنو لێوەرگرتن.

ئەوەی کە لێرەدا شایانی باسو دەربڕین بێ ئەوەیە کە هەموو کەس لە ئەندامەکانی ئەم کۆمەڵی ئیسلامە ناتوانێ یاساو ڕژێمی ژیان راستەوخۆ لە قورئانەوە تێبگاو وەربگرێ هەتا زۆر چاك شارەزای فەرموودەکانی پێغەمبەرو چۆنیەتی ژیانی ئەو نەبێ، بۆیە موسوڵمانانی جیهان پێویستە سوپاسی ئەو چاکە گەورەیە بکەن کە ئەم پێشەوا دڵسۆزانە بۆیان جێبەجێکردوونو بۆیان بەجێهێشتوون. ئەوانەی کە هەموو ئەو ئەرکانەیان کێشاوە تا پەڕاوەکانی (فقه)یان ڕێك خستوەو دایان ناون، دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆرو تێکۆشانو هەوڵدانێکی گەورەو بێوچان، وە بەرهەمی ئەم هەوڵدانو تێکۆشانەی ئەوان ئەوەیە کەموسوڵمانەکان لە ئەمڕۆدا زۆر بەئاسانی یاساو بەرنامەی ئیسلامی ئەناسن و پەیڕەوی ئەکەن. لەسەرەتاوە گەلێ کەس پەڕاوی (فقە)یان ڕێك خستو دانا. بەڵام لە ئەنجامدا تەنها چوار ڕێگا یا چوار بۆچوون (مذاهب) لەو ڕێگایانە مایەوە کە زۆربەی موسوڵمانانی جیهان ئەمڕۆ شوێنی ئەو چوار ڕێگایە کەوتوون:

١. یەکەمیان ئەو ڕێگایەیە کە پێشەوای بەڕێز (ابو حنیفە) دایناوە کە پێی ئەوترێ (الفقه الحنفي)، وەئەم ڕێگایە خۆیو چەند هاوەڵێکی ڕێکیان خستوەو

روونیان کردووەتەوە وەکو (ابو یوسف و محمد و زفر) وەهەندێ لە زانایانی بەرزی تریش.

٢. دووەمیان ئەو ڕێگایەیە کە پێشەوای ڕۆشنبیر (مالکی کوڕی ئەنەس) خوا لێی خۆش بێ وەریگرتووەو ڕێکی خستووەو دایناوە، کە ناوئەبرێ بە (الفقه المالکی).

٣. سێیەم ئەو ڕێگایەیە کە پێشەوای مەزن (محمدی کوڕی ئیدریس)ی شافیعی خوالێیخۆش بێ وەریگرتووەو ڕێکی خستووە کەبە (الفقه الشافعي) ئەناسرێ.

٤. چوارەم ئەو ڕێگایەیە کە پێشەوای بەنرخ (احمدی کوڕی حنبل) خوالێی خۆش بێ ڕێکی خستووەو دایناوە کە پێی ئەڵێن (الفقه الحنبلی).

وە دانان و ڕێکخستنی ئەم چوار ڕێگایەش لەسەدەی یەکەم و دووەمی کۆچیدا کراوەو هاتوەتە کایەوە، وە ئەو جیاوازیە کەمەیش کە لە نێوانیاندا هەیە جیاوازیەکی سروشتییەو چونکە بێگومان هەرشتێ چەند بیرێکی لەسەر کۆببێتەوەو دەست بە لێکۆڵینەوەو تێگەیشتنی بکەن هەر جیاوازیان تێدا پەیدا ئەبێ با کەمیش بێ، ئەمەیش لەبەر ئەوەیە چونکە تێگەیشتن و وەرگرتن لە هەموو کەسێکا لەیەك شێوەو لەیەك رادەدا نییە، بەڵام ئەم زانا دڵسۆزانە هەموویان ڕاستگۆو خواناس بوون، وە هەمیشە بەدوای ڕاستیدا گەڕاون وەبەهیچ شتێ نەیان گۆڕیوەتەوە، بۆیە موسوڵمانان بڕوایان هەیە بەڕاستی هەموو ڕێگاکان و بڕیاریان وایە کە هەموویان ڕاستن.

بەڵام وادیارە پێویستە لەسەر هەموو کەس کە لەم چوار ڕێگایە کە شوێنی یەکێکیان بکەوێ، چونکە زۆربەی زانایانی ئیسلام لەسەر ئەم بڕیارەن کە ئەبێ موسوڵمان شوێنی یەکێ لەم چوار ڕێگایە بکەوێ، وەلەم چوارە بەدەر ڕاست نییە شوێنی ڕێگایەکی تر بکەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێکیتر لە زانایانی

ئیسلام ئەڵێن: هیچ پێویست ناکات کە ئێمە شوێنی تەنها یەك ڕێگای تایبەتی بکەوین، بەڵکو هەرکەسێ خوای گەورە دەرگای زانیاری و تێگەیشتنی لێ بکاتەوە بۆی هەیە کە ڕاستەوخۆ لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە یاساو بەرنامە وەربگرێ، وەئەوانەش کە زانیاریەکی وایان نی یە کە بتوانن لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرەوە ئەم کەڵکە وەربگرن پێویستە شوێنی یەکێ بکەون کە بڕوایان بە زانین و ڕاستی و خواناسیی هەیە، وەئەمانە ناو ئەبرێن بە (أهل الحدیث) وە ئەمانیش لەسەر ڕاستین وەکو چوار تاقمەکەی تر کە باسمانکردن.

## صۆفیەتی (التصوف)

ئەم لێ وەرگرتنەی کە ئێستا باسمان کردو بە زمانی عەرەبی ناو ئەبرێ بە (فقە) لە کردەوەی مرۆڤەکاندا تەنها پەیوەندی بە رووی دەرەوە هەیەو بەس، وە بە هیچ شێوەیە گوێ ناداتە دیوی ناوەوە، تەنها سەیری ئەوە ئەکات کە ئایا ئەو ئیشەت بە وێنەی داواکراوی خۆی جێ بەجێ کردووە یان نا؟

ئینجا ئەگەر بەو شێوەیە ئیشەکەت ئەنجام دابوو ئەوا وەریئەگرێ و گوێ ناداتە ناوی دەروون و چۆنیەتی دڵت بەرامبەر ئەو ئیشە، بەڵام ئەو شتەی کە پەیوەندی بە دڵەوە هەیەو گرنگی ئەداتێ و لێی ئەدوێ ئەوەیە کە پێی ئەڵێن (تصوف).

بۆنمونە نوێژەکەت هەردووکیان رووی تێ ئەکەن و لێی ئەکۆڵنەوە، بەڵام (فقە) هەر لەو رووەوە لێی ئەدوێ کە ئایا دەست نوێژەکەت تەواو گرتووە وەئایا لە نوێژەکەتا رووت لە قیبلە بووە؟ وەلەکاتی خۆیدا نوێژەکەت کردووە یان نا؟ وەئایا هەموو بەشەکانی نوێژەکەتلە جێگای خۆیاندا بە جێ هێناوە؟ وەئایا ئەوەی کە دانراوە لە نوێژدا بخوێنرێ ئەوەت خوێندووە؟ ئەگەر بەمانە

هەڵسابووی بە ڕێك و پێکی هەموویانت کردبوو ئەوە بەپێی یاسای (فقە) نوێژەکەت تەواوەو تۆ نوێژگەری، بەڵام ئەو ڕووەی کە (تصوف) گرنگی ئەداتی و لێی ئەکۆڵێتەوە: ئایا لەو کاتەدا کە نوێژەکەت کرددڵت چۆن بوو؟ ئایا بەتەواوی دڵت لای خوا بووە؟ وە لە دڵتا ئەوەت ئامادەکردبوو کە خوای پەروەردگارئاگادارەو ئەتبینێ؟ وە ئەو هەستەت تێدا بوو کەلەم نوێژەدا تەنها مەبەستت پەروەردگاری گەورەیەو بەس؟ وە هەروەها ئەم نوێژە تا چ ڕادەیەك گیان و دەروونی پاك و خاوێن کردوویتەوە؟ وە تا چ ڕادەیە بە هۆی ئەم نوێژەوە ڕەوشتت جوان بووە؟ وەئایا کردوویتی بە موسوڵمانێکی ڕاست و ڕاستگۆ کە بەپێی بڕواکەت بجوڵێیتەوەو ڕەفتار بکەی؟ وە هەروەها ئەم نوێژە تا چ ڕادەیەك پاڵت پێوە ئەنێ بۆئەوەی لە ڕێگای ئەم ئایینەدا تێبکۆشی و کوڵ نەدەی و ماندوو نەبی.

ئینجا لە نوێژەکەتا چەندە لەم ماناو مەبەستانەی نوێژت بۆ پەیدا بووبوو لەیاسای تەصەوفدا ئەوەندە نوێژەکە تەواوەو بایەخی هەیە وە چەندە کەم و کوڕی ببێ لەبارەی ئەم مەبەستانەوە ئەوەندە بە ناتەواو کەم وکوڕ سەیر ئەکرێ لە یاسای تەصەوفدا.

وا ئێستا نمونەیەکت بۆ دێنمەوە کە ئەم جیاوازیەت بەتەواوی بۆ ڕوون ببێتەوە:

ئەگەر پیاوێك هات بۆلات، تۆ لە دوو ڕووەوە سەیری ئەکەیت و لێی ئەکۆڵیتەوە: یەکەمیان لەو بارەیەوەیە ئایا ئەم پیاوە لەش ساغەو ئەندامەکانی تەواون یان نا تەواوەو لە دیمەندا کوێری و شەلی تێدایە؟ وەئایا ڕووخۆش و پێکەوتووە یان گرژو ناشیرینە؟ وە ئایا بەرگێکی تازەو بە نرخی پۆشیوە یان شڕو بێنرخی لەبەر کردووە؟

ڕووی دووەمیش ئەوەیە ئەتەوێ بزانی خورەوشتی چۆنەو لە ژیریی و

زانیاریو باشیو تێگەیشتندا لە چ پلەیەکدایە؟ جا (فقە) تەنها رووی یەکەم سەیر دەکاو لێی ئەکۆڵێتەوەو بڕیارو فەرمانی خۆی لەسەر دەرئەکا، تەصەوفیش رووی دووەم سەیر دەکاو لێی دەکۆڵێتەوەو بڕیاری خۆی لەسەر دەرئەکات.

هەروەها کاتێ ویستت یەکێ بکەی بە دۆستو هاوەڵی خۆت لە دوو رووە سەیری ئەکەیتو لێی ئەکۆڵیتەوە: هەرچۆنێ حەز ئەکەیت کە دیمەنو شێوازی رێكوپێك بێو رواڵەتو روخساری جوانو بەژنو باڵای بەرز بێ، هەروەها حەز ئەکەیو پێت خۆشە کە ناو دڵو دەروونیشی جوانو رازاوە بێ بە رەوشتی جوانو نیازی خاوێنو دڵسۆزیو بەزەییو رۆشنبیری.

هەربەم جۆرە لەبەردەم ئاوێنەی بەرنامەی ئیسلامدا هیچ ژیانێ جوانو بەنرخ نییە ئەو ژیانە نەبێ کە بەتەواوی رێك بێ لەگەڵ بەرنامەی ئیسلامدا لەهەردوو رووی دەروو ناوەوە بێجیاوازی. وە نمونەی کەسێك کە خواپەرستیەکەی لە دیمەندا تەواوە بەڵام لە ناوەوە گیانی خواپەرستی راستی تێدا نییە وەکو لەشێك وایە کە گیانی تێدا نەمابێ، وە نمونەی ئەو کەسەیش کە گرنگی داوە بە ناوو بەڵام لە دیمەنو لە رووی‌دەرەوە راست نییە وەکو پیاوێکی هێمنو لەسەرخۆ وایە کە رواڵەت ناشیرینو شەلو کوێربێ.

هیوام وایە بەم نمونەیە زۆر چاك پەیوەندی نێوان (فقە و تصوف) بزانیو بۆت روون بووبێتەوە.

بەڵام بە داخەوەو بە دڵێکی برینداڕو خوێناوی‌یەوەو، بە چاوێکی پڕ لە گریانەوە ئەڵێم: لەم دواییەدا، لە کاتێکا زانیاری راستەقینەو رەوشتی بەرزو جوان رووی کردە کزی و پلەی بەرزیان نزم بووەو هاتە خوارەوە، وەبەم هۆیەوە خراپەو کاری نارەواو رەوشتی ناشیرینو ناپەسەند پەیدا بوو و پەرەی سەند. لەم کاتە سەرچاوەی تەصەوفی پاكو بێگەردیان لێڵو لیخن کرد. وە

موسـولمانەكان هـەندێ فەلسـەفەی بێگانـەیان لـە گـەل و نەتـەوەكانی تـرەوە وەرگـرت و بـە (تصـوف)ەوە تێكـەڵی بەرنامـەی ئیسـلامیان كـرد و بـەرگی تەصەوفیان كرد بەبەری گەلێ لەو رێگاو بیروباوەڕە بێگانانـەی كە بە هیچ شێوەیە لە قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەردا نین و دەست ناكەون، دوای ئەوە وەردە وردە ئەم جۆرە مەردمانە دەستیان دایە ئـازادكردنی خۆیـان لـەزۆر لـە یاساو بڕیارەكانی ئیسلام، وەدەستیان كـرد بـە دەربڕینـی ئـەم وتـە بێمانـاو بێجێیە كە ئەڵێ: تەصەوف هیچ پەیوەندی بە شەریعەتەوە نی‌یە، بە شێوەیە كە (شەریعەت) لە شێوێكدایەو تەصەوف لە شێوێكی‌تردایە، پێویست نی‌یە كە صۆفی خۆی ببەستێ بە یاساو بڕیارەكانی شـەریعەتەوە، زۆر جار ئەم قسـە پڕوپـووچ و بێمانایانە ئەبیسترێ لە زۆر لـەو صۆفیـە نـەفام و نەزانانـەوە كەلـە تەصوف هیچ نازانن و تەپی لـێ ناپێكن، بێگومـان ئەم جۆرە قسـەو باسانە لە راسـتیدا پڕوپـووچ و درۆو دەلەسـە زیـاتر هیچی‌تـر نـین، وە بـەهیچ شـێوەیە دروست نی‌یە كە صۆفی خۆی لە نوێژو رۆژوو و زەكات و حـەج بكێشـێتەوە بەبیانوی ئەوەوە كە شێخە یان صۆفی‌یە، وەبە هیچ شێوەیە راست نی‌یە كە صۆفی پێچەوانەی ئەو بڕیارو فەرمانانە بجوڵێتەوە كە پێغەمبەری خواﷺ باسی كـردووە لەبابـەت ئـابوری و كۆمەڵایەتی‌یـەوە وەلەبابـەت ژنـهێنان و رەوشـت و پـەیوەندی ناو مەردمـەوە، وەلەبابەت مـاف و پێویستیەكانی مرۆڤ و سـنووری حەڵاڵ و حەرامـەوە، ئـەو كەسـەی كـە بـە جوانـی و راسـتی شـوێنی پێغەمبـەر نەكەوێ و خۆی ناوبنـێ صۆفیـەكی ئیسلامی، چونكە ئەم جۆرە تەصەوفە لـە ئـایینی ئیسـلامدا نی‌یـەو بێگانەیـە، وە تەصـەوف لـە راسـتیدا بریتی‌یـە لـە خۆشەویستی خواو پێغەمبەری خوا، وەبگرە بریتی‌یە لەوە كە بەتەواوی ئەو پـەڕی خۆشەویستی خـواو پێغەمبـەر چووبێتـە دڵیەوە بەشـێوەیە كە لـە رێگـای ئەواندا گیانی بەخت ئەكا.

ئەم گیان بەختکردن و قوربانی دانەش وا ئەگەیەنێ کە نابێ ئەوەندەی سەرە موویەك لە شوێنکەوتنی بڕیارو فەرمانەکانی خواو پێغەمبەر لابدا، کەواتە تەصەوفی راستی شتێکی جیاوازو سەربەخۆ نییە لەبەرنامەی ئیسلام (الشریعة الاسلامیة)، بەڵکو بریتییە لە پێهەڵسان و جێبەجێکردنی بڕیارو فەرمانەکانی ئەم بەرنامەیە بەوپەڕی دڵسۆزیو نیازی خاوێن و رووناکی دەروونەوە.

## بەشی حەوتەم

# فەرمانەکان و بڕیارەکانی بەرنامە
# (أحكام الشريعة)

* سەرەتاییەکانی بەرنامە.
* مافەکان وچواربەشەکەی.
* مافەکانی خوای پەروەردگار.
* مافەکانی خۆت.
* مافەکانی مەردم
* مافی دروستکراوەکانی تر.
* بەرنامەیەکی جیهانی وهەتاهەتایی.

*لەم بەشەی دواییەدا هەندێ لەسەرەتاییەکانی بەرنامەو بڕیارو فەرمانە گرنگەکانیت بۆباس ئەکەین، بۆئەوەی بزانی کەچۆن بەرنامەی ئیسلام ژیانی ئادەمیزاد بەرێبازێکی ڕێك وپێکدا ئەبا، وەبزانی ئەو ڕێبازە چۆن پڕیەتی لەمەبەستی بەسوودو بەرژەوەندی مرۆڤ.*

## سەرەتاییەکانی بەرنامە

ئەگەرجوان سەرنج بدەیت وبیرێ لەخۆت بکەیتەوە تێئەگەی کەکاتێ هاتویتە ئەم جیهانەوەو هەڵتگرتووە کە هەریەکە لەوانە وات لێ داوا ئەکات کەپێویستە لەشوێنی خۆیدا بەکاری بێنیێ و نابێ پشتگوێی بخەیت و گرنگی نەدەیتێ، بۆنموونە: ژیری و پەلاماردان و حەزلێکردن و چەشتن و چاوو گوێچکەو هێزی دوو دەست و دوو پێت دراوەتێ و لەگەڵتایە، وە هەروەها هەستی لێ دوورکەوتنەوەو توڕەیی و خۆشەویستی و ترس و ئازاییت دراوەتێ و لەگەڵتایە، وە هیچ کام لەم شتانە بێسوودو بێکەڵك نین، بۆیە پێت دراون چونکە پێویستت پێیانە؛ ئینجا بۆ ئەوەی لەم ژیانی جیهانەدا سەرکەوتووبیت، ئەبێ ئەوەی کە سروشت و بەهرەکانت داوای ئەکەن جێبەجێ ی بکەی و بیهێنیتە کایەوە، بەڵام بۆ ئەم کارە گرنگە پێویستە هەرچی توانات دراوەتێ هەمووی بخەیتە کارەوە.

بێگومان هەندێ هۆو بەڵگەت دراوەتێ کە زۆر باش بۆت ئەکرێ و ئەتوانی هێزو بەهرەکانت بەکاربێنێ و بیانخاتە ئیش وکارەوە، یەکەم هۆیە لەم هۆیانە بریتی یە لەلەشی خۆت کە پێویستیەکانتی هەموو تێدا دەست ئەکەوێ، دوای ئەوە بەدەوروبەرتا بوونەوەرە گەورەیە هەیە کە ئەوەندە بەڵگەو هۆی جۆربەجۆری تێدایە بۆئەوەی یارمەتیت بدەن، گیانەوەرو ڕووەك و زەوی و ئاووهەواو ڕووناکی و گەرمی تێدایە، هەروەها شتی تر کە جگە لە خوا کەس ژمارەیان نازانێ، بێگومان ئەم هەموو شتە زۆرانەش خوای گەورە بۆ مرۆڤی دروست کردووەو ژێرباری کردووە، بۆئەوەی ئەویش بە جوانی ڕامیان بێنی و

بەکاریان بێنێ لە پێکهێنانو پێویستی ژیانی خۆیدا، هەروەها لە روویەکی ترەوە وردبەرەوە ئەبینی ئەم بەهرەو هێزانەت بۆ سوودی خۆت دراوەتێ نەك بۆ زیانت، ئەگەر هەر زیانی تێدا بوو ئەبێ هەر لە رادەی ناچاریدا بوەستێتەوە، وە ژیریی تێگەیشتنی مرۆڤ ئەڵێ هەر وێنەو شێوەیە کە لەمە بەدەر بێ ئەوە راست نییە، بۆنموونە ئەگەر کردەوەیەکت زیانی پێگەیاندی ئەوە بە هەڵە لەسەرت دائەنرێ، هەروەها ئەگەر هێزێ لە هێزەکانت یا بەهرەیە لە بەهرەکانت بە شێوەیە بەکارهێنا کە زیانی بەیەکێ گەیاند خراپت کردوەو بەهەڵە چووی، یا ئەگەر هێزێ لە هێزەکانت بە جۆرێ بەکارهێنا کە هۆیە لە هۆیەکانی ژیانی لەکار خستی و پشتگوێ خرا، دووبارە بەهەڵەو ناراست دائەنرێی، ئابەم شێوەیە ژیریی مرۆڤ شایەتی ئەوە ئەدا کە هەموو جۆرە زیانێ پێویستە لێی دووربی و خۆتی لێ بپارێزی، وە نابێ لەسەری راوەستی و پێت خۆشبێ، مەگەر کاتێ کە نەتوانی لێی دووربی وەیا بەرامبەر بەو زیانە سوودێکی گەورەترت هەبێ، وەئەگەر زیاتر بیر بکەیتەوە ئەزانی کەلە جیهاندا دوو جۆر ئادەمیزاد هەیە: جۆری یەکەم ئەوانەن کە بەدەستی خۆیانو بەتایبەتی بەشێك لەم هێزو بەهرانەی خۆیان بەکارئەهێنن لەو شوێنانەدا کە هێزەکانی تریان لەکار ئەکەوێو لەناو ئەچن یان زیان بە مەردمی تر ئەگەیەنن، وەیا ئەو هێزو ئامرازانەی کە پێیان دراوە پشتگوێی ئەخەنو بەکاری ناهێنن.

جۆری دووەم، ئەوانیش هەروا ئەم شتانە ئەکەن بەڵام بەبێ ئاگاییو بە نەزانین، ئینجا جۆری یەکەم پیاوی خراپن پێویستە کە یاسایەکی بەهێز ببێ بۆ ئەوەی دەست بگرێ بەسەریانداو لە شوێنی خۆیان رایان وەستێنێ، وە جۆری دووەمیش بێئاگاو نەزانن ئەمانیش پێویستیان بە زانیاری هەیە تێیان بگەیەنێ کامەیە ئەو شێوەو وێنە راستەی کە هێزو بەهرەی خۆیانی پێویستە تێدا بەکار بهێنن.

ئینجا بەرنامەی ئیسلام هاتو ئەم پێویستەی جێبەجێ کردو ئەم

مەبەستەی هێنایە دی، ئەم بەرنامەیە نایەوێ کە تۆ هیچ هێزێ لە هێزەکانت پشتگوێ بخەیت و گرنگی‌یان نەدەیتێ، یا حەزێ لە حەزەکانت بچەوسێنیتەوە یان هەستێ لەهەستەکانت بسڕیتەوەو لەناوی بەری، کەواتە پێت نالێ واز لە ژیانی جیهان بهێنەو بڕۆ بۆ شاخ و دارستان و ئەشکەوتەکان لەوێ ژیانی خۆت تەواو بکە، وەیا ئارەزووی خۆت بگوشەو تەکی پێ‌هەڵچنەو بیخەرە ژێر باری سزاو ئازارەوە بۆ ئەوەی بیکوژێ‌و لەناوی‌بەری، وە هەرچی جوانی و خۆشی ئەم جیهانە هەیە هەمووی لەسەر خۆت قەدەغە بکەو نزیکی مەبەرەوە، نەء وانی‌یە، چونکە بەرنامەی ئیسلام ئەو خوایە دایناوە کە ئەم جیهانەی بۆ مرۆڤ دروست کردووە، چۆن پێی خۆشە کە جیهانەکەی بڕوخێنرێ‌و لەناو ببرێ؟ خوای پەروەردگار لە مرۆڤدا هێزێکی دانەناوە کە پێویستی پێی نەبێ‌و بێ‌سوودبێ، وەهەروەها هیچ شتێکی لەم زەوی‌و ئاسمانەدا بێ‌هوودەو بێ‌کەڵک دروست نەکردووە، بەڵکو ئەیەوێ ئەم کارگەیە لەسەر یاسایەکی رێك‌و پێك بڕوا بەڕێوەو هەموو شتێکی لە جێگای خۆدا بێ‌و مرۆڤ لە هەمووی کەڵك وەرگرێ. وە هەموو بەڵگەو هۆیەکان بەکار بێنی، بەڵام بە جۆری نەزیان بەخۆی بگەیەنێ نەبەیەکێکی‌تر، بۆ ئەم مەبەستە مەزن‌و پیرۆزەیە کە خوای گەورە هەندێ رێبازو یاسای داناوە.

ئابەم شێوەیە بەرنامەی ئیسلام لەم جیهانەدا هەرشتێ کە زیان بە مرۆڤ بگەیەنێ یاساغ‌و قەدەغەی کردووە، وە هەرشتێکیش کە سوودی ببێ‌و زیانی یەکێکی‌تری تێدا نەبێ بۆی بڕیار داوەو رەوایە کەبەکاری بێنێ. ئەو بناغەو بنکەیەی کە بینای ئەم بەرنامەیەی لەسەر دانراوە ئەوەیە کە مرۆڤ مافی هەیە هەوڵ بدا بۆ بەجێهێنانی ئارەزوو وپێویستەکانی خۆی، وەبەهەموو توانای تێبکۆشێ لە پێناوی کەڵك‌و سوودی خۆیدا، بەڵام هەر لەهەمان کاتدا پێویستە کە بەشێوەیە لەسەر ئەم مافانەی خۆی کار بکاو بجوڵێتەوە کە زیان بەمافی کەس نەگەیەنێ بە نەزانین وەیا خراپی‌و دەستدرێژکردن، بەڵکو ئەبێ کۆمەکی‌و

یارمەتیان بدات بەپێی توانای خۆی، بەڵام شتی وا هەیە کە زیانو کەڵکیشیان تێدایە، لەم جۆرە شوێنانەدا بەرنامەی ئیسلام ئەڵێ: پێویستە مرۆڤ زیانی بچووك هەڵگرێ لە پێناوی سوودێکی گەورەدا، وە سوودی بچووك واز لێبێنێ لەبەر خۆپاراستن لە زیانێکی گەورە، وە مرۆڤ ناتوانێ لە هەموو کاتو چەرخێکا سوودو زیانی هەموو شتێ تێبگا، لەبەر ئەوە خوای پەروەردگار. چونکە زانایەو هیچ شتێکی لێ ون نابێ. بەرنامەیەکی راستو تەواوی ناردووە بۆ ژیانی ئادەمیزاد، کە مەردم لە چەرخەکانی پێشوودا سوودو قازانجی ئەم بەرنامەیەیان نەئەزانی، بەڵام پێشکەوتنی زانیاری لەم چەرخەدا پەردەی لەسەر لاداوەو روونی کردووەتەوە، بەڵکو هێشتا لەم چەرخەیشدا مەردم سوودو کەڵکی ئەم بەرنامەیەیان بەتەواوی بۆ دەرنەکەوتووەو پێی نازانن، وەرۆژ بەرۆژ کە زانیاری پێش ئەکەوێ، سوودو قازانجو کەڵکی ئەم بەرنامەیە دەرئەکەوێو ئەناسرێ، ئەوانەی کە هەموو پاڵپشتێکیان زانیاریو ژیریە ناتەواوەکەی خۆیانە دوای ئەوەی کە چەند سەدەیە لە تاریکیو وێڵیو گووم بوندا ئەتلێنەوە، ئینجا رێبازێ لە رێبازەکانی ئەم بەرنامەیەیان بۆ دەرئەکەوێ، بەڵام ئەوانەی کە بڕوایان بە پێغەمبەری خوا هەیەو رێگا روناکەکەیان گرتووە زۆر چاك پارێزراون لە ئەنجامی نەفامیو زیانەکانی چونکە هەمیشە لەسەر ئەو یاساو بەرنامەیە ئەڕۆن کە لەسەر بنچینەی زانیاری خاوێن داڕێژاوە، ئیتر بزانن بەو سوودو قازانجەی کە تیایەتی یان نا.

## مافەکان و چوار بەشەکەی

بەپێی بەرنامەی ئیسلام هەموو ئادەمیزادێك چوار جۆر مافی بەسەرەوەیە، ئەبێ جێبەجێیان بکات:

١. مافەکانی خوای پەروەردگار.

٢. مافەکانی خۆت.

٣. مافەکانی مەردم.

٤. مافی ئەو شتەی کە لەبەر دەستایەو لە کەڵك و سوودی خۆتا بەکاری دێنێ.

پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی راست کە ئەم چوار مافە بزانێت و بەهەموو دڵسۆزیو راستیەکەوە جێبەجێیان بکات، وەبەرنامەی ئیسلامیش ئەم مافانەی یەکەیەکە باسکردووەو روونی کردووەتەوە، وە بۆهەموویان چەند رێگاو پرۆگرامێکی داناوە کە یارمەتی ئادەمیزاد ئەدات بۆ ئەوەی ئەم مافانە جێبەجێبکات بەشێوەیە کە هیچیان لەناو ناچێ و بزر نابێ لە سنووری دەسەلاًت و تواناادا.

## مافەکانی خوای پەروەردگار

یەکەم ماف لە مافەکانی خوای گەورە ئەوەیە کە بڕوات پێی ببێ و هیچ شتێك نەکەی بە هاوەڵی، وە بێجگە ئەو هیچی تر بە پەرستراو، وەیا پەروەردگار دانەنێی، وەبەجێهێنانی ئەم مافەش بەوە ئەبێ کە بڕوات بەڕستەی (لا الە الا اللە) ببێ کەلە پێشەوە باسمان کرد. مافی دووەم لە مافەکانی خوا ئەوەیە کە بڕوای تەواوت هەبێ بەوەی کە هەرچی لەلایەن ئەوەوە نێررابێ راستەو هیچ گومانی تێدا نییە، وەئەم مافەیش بەوە جێبەجێئەکرێ کە بڕوات ببێ بەڕستەی (محمد رسول اللە)، بەو جۆرەی کە لەپێشەوە روونمان کردەوە.

مافی سێیەم لە مافەکانی خوا ئەوەیە کە (بەگوێی بکرێ)، ئەم مافەیش بەوە جێبەجێئەکرێ کە شوێنی ئەو یاساو بەرنامەیە بکەوی و رەفتاری پێبکەی کە پەڕاوی خوا باسی کردووەو فەرموودەی پێغەمبەر روونی کردوەتەوە بەو شێوەیە کەلە پێشەوە باسکرا.

مافی چوارەم لە مافەکانی خوا ئەوەیە کە (بپەرسترێ)، وە بۆ جێبەجێکردنی ئەم مافەیش ئەو شتانە پێویست کراوە لەسەر مرۆڤ کەلەبەشی پێنجەمدا باسمان کردن.

وە لەبەر ئەوەی ئەم مافە لە مافەکانی تر گەورەترە پێویستە تا رادەیەك

هەندێ لە مافەکانی‌تر لە پێناویدا بکرێن بە قوربانی، بۆ نمونە لە کاتێکدا مرۆڤ هەڵئەسێ بەکردنی نوێژ و ڕۆژوو ئەبینی گەلێ لە مافەکانی خۆی لە پێناویاندا لەناو ئەبا، زوو لە خەو هەڵئەسێ بە ئاوی سارد دەست نوێژ ئەگرێ لە شەوو ڕۆژدا زۆر جار دەست لە ئیش‌وکاری خۆی هەڵئەگرێ بۆ بەجێهێنانی نوێژەکانی، یەك مانگی ڕەبەق جڵەوی ئارەزووی خۆی ئەگرێتەوە بۆ بەجێهێنانی ڕۆژووی ڕەمەزان، خۆشەویستی خوا هەڵئەبژێرێ بەسەر خۆشەویستی ماڵدا لە پێناوی جێبەجێکردنی زەکاتدا، ناخۆشی ڕێگاو ئێش‌و سزای ڕۆیشتن‌و خەرجکردنی ماڵ هەڵدەگرێ لە پێناوی حەجکردندا، گیان‌و سامانی ئەکا بە قوربانی لە پێناوی تێکۆشان (الجهاد) لە ڕێگای خودا.
هەروەها جاری وایش ئەبێ مافی مەردم کەم یان زۆر ئەکا بە قوربانی لە پێناوی بەجێهانی مافی خوادا، بۆ نمونە بەندە لەکاتی نوێژدا دەست لە ئیشی گەورەکەی هەڵئەگرێ بۆ ئەوەی مافی یەکێ جێبەجی‌بکا کەلە گەورەکەی گەورەترە، لە کاتی حەجدا واز لە ئیشوکاری ژیان‌و بازرگانی دێنێ‌و ماڵ‌و منداڵی بەجێدێڵێ‌و ئەچی بۆ ماڵی خوا لەشاری (مەککە)، دیارە ئەمەیش گەلێ لە مافی مەردمی تیا لەناو ئەچێ، وەلەکاتی (جهاد)دا لەبەر خواو لە پێناوی ئایینەکەیدا ئەکوژرێ‌و بۆ مافی خوا زۆر شتی تر ئەکا بە قوربانی، وەکو خەرجکردنی ماڵ و تیاچوونی گیان‌و سامان، سەرەڕای ئەمەیش خوای گەورە بۆ بەجێهێنانی ئەم مافانەی خۆی سنوورێکی دیاری‌کراوی داناوە بۆ ئەوەی مافەکانی تر لە پێناوی مافی ئەودا لەناو نەچن‌و نەبن بە قوربانی مەگەر لە ڕادەیەکدا کە چارە نەبێ‌و پێویست بێ ئەوەندەی تیا لەناوبچێ.

بۆ نمونە: خوای گەورە لە نوێژدا نایەوێ کە ئازار بچێژێ، بەڵکو ئاسانی‌و بی‌ئازاری بۆت ویستووە، نابینی ئەگەر ئاوت دەست نەکەوت، یا نەخۆش بووی ئەتوانی لەباتی ئاو تۆزی خاوێن بەکار بهێنی، ئەگەر لەسەفەردا بوویت ئەتوانی نوێژەکانت کورت‌و کۆ بکەیتەوە، ئەگەر نەتوانیت بە پێوە ڕاوەستیت بۆت هەیە

به دانیشتنەوە یان بەراکشانەوە نوێژ بکەی، هەروەها ئەوەی کە پێویستە لە نوێژدا بیخوێنی ئەتوانی بەچەند خولەك(دقیقە)یەك تەواوی بکەی، بەرنامەی ئیسلام پێت ئەڵێ ئەگەر ئاسایش و بێئیش بووی بۆت هەیە بە ئارەزووی خۆت درێژە بە نوێژەکەت بدەی، وە سورەتی (البقرة، آل عمران، نساء) بخوێنی، بەڵام لە کاتی ئیشا نابێ درێژەی پێبدرێ، هەرچەند خوای گەورە پێی خۆشە کە سەرەڕای نوێژە دیاریکراوەکان (الصلوات المکتوبة) گەلێ نوێژی تر بکەی، بەڵام هەرگیز نایەوێ کە خەوی شەو و رابواردنی رۆژ لە خۆت قەدەغە بکەی، یان کاتی ئیش وکارت لە نوێژکردندا خەرج بکەی، یان واز لە هەموو ئیشوکاری ژیانت بێنی بۆ نوێژ کردن وە مافەکانی‌ترت هەموو لە کیس بچێ و نەتوانیت جێبەجێیان بکەی.

هەروەها خوای گەورە گەلێ ئاسانی خستوەتە رۆژووەوە، ئەوەتا لە ساڵێکا یەك مانگی پێویست کردووە، وەلەکاتی نەخۆشی و لە ماڵ دەرچووندا بۆت هەیە رۆژووەکەت دوابخەیت بۆ رۆژانی‌تر، وەنابێ لەو ماوەیەی کە بۆی دانراوە یەك چرکەی بۆ زیاد بکەی وە رۆژوان هەر لە ئێوارەوە هەتا رۆژ دەبێتەوە ئازادە بۆ خواردن و خواردنەوە، وە کاتێ کە خۆر ئاوا بوو پێویستە گورج رۆژووەکەی بشکێنێ و بەربانگ بکاتەوە، وەهەرچەند خوای گەورە پێی خۆشە کە مرۆڤ گەلێ رۆژووی تر بگرێ، بەڵام بە هیچ شێوەیە پێی خۆش نی‌یە ئەوەندە رۆژوو بگرێ خۆی ئازار بدات و لە ئیشوکار بکەوێ.

وەهەروەها لە زەکاتدا بەشێکی کەم دانراوە کە بدرێ و ئەبێ ئەو ماڵەش بگاتە رادەی زەکات، وەهەرچەند خوای گەورە پێی خۆشە کە مرۆڤ زیاتر لە زەکات خەرج بکاو بیدا لەرێگای خوادا، بەڵام هەرگیز نایەوێ کە ماڵی خۆی بە فیڕۆبداو مافی منداڵەکانی لەناو بباو خۆی بێماڵ و دەست خاڵی بمێنێتەوە، بەڵکو پێویستە لەم روەوە رێگایەکی مامناوەندی بگرێ بۆ ئەوەی نە شیش بسوتێ و نەکەباب.

دوای ئەوە سەیری حەج بکە ئەبینی تەنها لەسەر ئەوانە پێویست کراوە کە توانای رۆشتن و هاتنەوەیان ببێ و بەرگەی ناخۆشی و ئازاری رێگا بگرن، سەرەڕای ئەمەش ئاسانی‌تری تێداکراوە، چونکە لەهەموو تەمەندا تەنها جارێك پێویست کراوە، وەئەگەر لە رێگادا شەڕو ئاژاوە بوو و لەخۆی ئەترسا ئەتوانێ حەجەکەی دوابخا بۆ کاتێکی‌تر، وە ئەبێ باوك و دایکی پێیان خۆش بێ کە ئەڕوا بۆ ئەوەی نەوەك دوای ئەو بەهۆی پیری و شتی واوە تووشی ئێش وئازار ببن.

بەم پێیە بۆمان روون ئەبێتەوە کە خوای گەورە مافەکانی مەردم ئەپارێزێ لەگەڵ مافی خۆیدا، واتە ماوەی نەداوە کەلەپێناوی مافی خۆیدا مافەکانی تر لەناو بچن مەگەر لە رادەیەکی وادا کەلەوە زیاتر پارێزگاری نەکرێ، گەورەترین قوربانی‌یە کەمافی مەردمی تیا ئەچێ ئەوەیە کە بۆ تێکۆشانی رێگای خوا پێشکەش ئەکرێ، چونکە مرۆڤ لێرەدا قوربانی ئەدا بە گیان و سامانی خۆی، وەبەگیان و سامانی مەردمیش، بەلام لە پێناوی فەرمانی خواداو بەپێی پێ‌خۆشبوونی ئەو، لەگەڵ ئەوەشدا یەکێ لە بەرنامە سەرەتاییەکانی ئیسلام ئەوەیە کە مرۆڤ زیانی کەم هەڵگرێ لەبەر خۆ پاراستن لە زیانێکی گەورەو ناخۆشتر، ئەگەر لەم بنکەیە جوان وردبیتەوە ئەزانی کە کوژران و لەناوچوونی سەدان هەزاران کەس زیانی لەوەی کە ناڕاستی سەرکەوێ بەسەر راستیداو ئایینی خوا ببێ بەژێر خوانەناسی و بتپەرستیەوە، وە زەوی پڕ ببێ لە ئاژاوەو گومڕایی و بەرەڵلایی. ئینجا بۆ ئەوەی ئەم زیانە گەورەیە روو نەدا خوای گەورە فەرمانی داوە بە بەندەکانی کە لەپێناوی ئایین و بەرنامەکەیدا تێبکۆشن، وەئەو زیانە کەمەی کە تووشیان ئەبێ هەڵیگرن و گوێی نەدەنێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ تەنها یەکێ بکوژن کە پێویست بێ بکوژرێ، وەدەستدرێژی نەکەن بۆ پیرو منداڵ و نەخۆش و بریندار، وەنابێ جەنگ بکەن تەنها لەگەڵ ئەوانەدا نەبێ کە جەنگیان لەگەڵدا ئەکەن، لەسەر رێگا ناڕەواو ناپەسەندەکەی خۆیان، وە

هەروەها نابێ لە وڵاتی دوژمن . بەبێ هۆیەکی دیاری . ناخۆشی و خراپەو ئاژاوە بڵاوبکەنەوە، وەهەر پەیمانێ لە نێوان ئەوان و دوژمندا بەستراوە ئەبێ بەگوێی بکەن و نەیشکێنن، وەئەگەر دوژمنەکانیان وازیان هێناو دوژمنایەتیان نەئەکرد لەگەڵ راستیدا پێویستە ئەمانیش وازیان لێ بهێنن و بە گژیانا نەچن، ئەمە هەمووی ئەوەمان تێئەگەیەنێ کە خوای گەورە بۆ بەجێهێنانی مافەکانی خۆی تەنها ئەوەندەی داناوەو پێویستی کردووە کە نەبێتە هۆی تیاچوون و لەناوبردنی مافەکانی مەردم.

## مافەکانی خۆت

ئەتوانین لێرەدا بەشی دووەم لەو مافانە باس بکەین کە مرۆڤ لەسەریەتی جێبەجێیان بکات کە ئەویش مافی خۆیەتی، لەوانەیە سەرسام ببی ئەگەر بڵێین مرۆڤ تاوان و دەستدرێژی زیاتر لە خۆی دەکات لەوەی لە یەکێکی تری دەکات، چونکە هەموو کەسێ هەست ئەکات و ئەزانێ کە خۆی لە هەموو کەس خۆشتر ئەوێ، وەهیچ کەس نی‌یە کە دان بنێ بەوەدا کە دوژمنی خۆیەتی، ئەگەر لەم شتە جوان بیربکەیتەوە راستیەکەت بۆ دەرئەکەوێ، گەورەترین و دیارترین بۆشایی و ناتەواویە کەلە سروشتی مرۆڤدایە ئەوەیە هەرکاتێ ئارەزووەکانی هێرشی بۆ هێنا ملی بۆ کەچ ئەکاو بە هیچ شێوەیە گوێ‌ناداتە ئەو زیانەی کە تووشی ئەبێ. ئەبینی پیاوێ کە گیرۆدەی خواردنەوەو سەرخۆشی بووبێ ئەو زیانەی کە تووشی ئەبێ لە ماڵ و تەندروستی و ناموسدا هەمووی هەڵئەگرێ و گوێی ناداتێ، یەکێکی‌تر ئەبینی کە زۆر حەز لە خواردن ئەکات و پەلاماری هەموو خواردنێ ئەدات سوودی ببێ یان زیان، وەلەپێناوی ئەو خواردنەدا خۆی تووشی گیروگرفت و لەناوچوون ئەکات، یەکێکی‌تر ئەبینی بووە بەبەندەی ئارەزوو ئیشی وا دەکات کەبەرەو مردنی ئەبات، یەکێکی‌تر ئەبینی کە رزگاری خۆی بووە بە ماخۆلانی سەری، لەبەر ئەوە بەتەواوی خۆی تەرخان کردووە بۆ پاککردنەوەی گیانی و بەرزکردنەوەی هەست و دەروونی، بۆیە دوژمنایەتی و

رقەبەری لەگەڵ خۆیدا ئەکات و ئەیەوێ ئارەزووەکانی خۆی پێشێل بکاتو نەیانهێڵێ، نایەوێ پێویستی خۆی جێبەجێبکات، ژن ناهێنێ و خواردنو خواردنەوەی کەم کردووەتەوەو لە جلوبەرگی جوان رقی هەستاوەو لەبەری ناکات بە شێوەیە کە جیهان لەبەرچاوی ئەو پڕیەتی لەتاوانو گوناهباریو حەزناکات هەناسەی تیابداتو لەناویا بێ لەبەر ئەوە پەنا ئەباتە بەر شاخو ئەشکەوتەکان، وەکو ئەم جیهانە بۆ ئەم نەکرابێ و نابێئەوی تێدابێ.

ئەمانە نموونەیەکی کەمن بۆ زۆرڕۆیشتن و لە سنوور دەرچوونی مرۆڤ لەم جیهانەدا، ئەگینا زۆر وێنەیتر هەیە بۆ لەسنوور دەرچوونو زۆرڕۆیشتن، کە بەچاوی خۆمان کات لە دوای کات ئەیانبینین، وەلەبەر ئەوەی ئاینی ئیسلام رزگاریو بەختیاری مرۆڤی ئەوێ، ئاگاداری ئەکاتەوە بۆ رێگایەکی گەورەو نەگۆڕاو کە ئەویش ئەوەیە کە خۆت مافت هەیە بەسەر خۆتەوە، ئەبێ خۆت بپارێزی لەهەر شتێ کە زیانت پێئەگەیەنێ، وەکو مەیو تلیاك و هەر شتێ کە سەرخۆشت بکا، وە پێویستە خۆت بپارێزی لە خواردنی خوێنو گۆشتی مردارەوەبوو، وە گۆشتی بەرازو دڕندە ژەهراویو پیسەکانی تر، چونکە ئەمانە کاری خراپ ئەکەنە سەر تەندروستی مرۆڤو رەوشتو هێزەکانی ژیریی تێك ئەدەن. وە بەرنامەی ئیسلام لەباتی ئەمانە هەندێ شتی پاكو پوختەو بەکەڵکی بڕیار داوە، وەبە مرۆڤ ئەڵێ: لەو شتە جوانانەی کە خوا بۆ مرۆڤی دروستکردووە کەڵك وەرگرەو خۆت پۆشتەو پەرداخ بکە، وەهەر بەم جۆرە داوای لێ ئەکا کەبە راستی هەوڵی رزقو رۆزی بداتو بەتەمەڵیو بێئیشی دانەنیشێت، وەدەستی پاڕانەوە لەمەردم درێژ نەکاتو هەناسەیە بەبرسێتی هەڵنەکێشێ. وە ئەو هێزو توانایانەی کە خوا پێی بەخشیوە لە سوودو قازانجی خۆیدا بەکاریان بهێنێ، وە هەوڵبدات لە هەموو رێگایەکی راستو رەواوە بۆ ئەوەی بگات بەو هۆیانەی کە خوا بۆی سازاندووە لەم زەویو ئاسمانەدا لەپێناوی ئاسایشو پەروەردەکردنو پێگەیاندنی خۆیدا، وە

بەرنامەی ئیسلام قەدەغەی ئەوەی کردووە کە ئارەزووی خۆت بکوژی‌و لەناوی ببەی، بەڵکو داوات لێ ئەکا کە ژن بخوازی‌و پێویستی ژیان جێبەجێ‌بکەیت. هەروەها ئەم بەرنامەیە قەدەغەی مرۆڤ ئەکات لەئەوەی کە خۆی بێ‌بەش بکات لە خۆشی‌و رابواردنی ئەم ژیانە، وە پێی ئەڵێ ئەگەر ئەتەوێ گیانت بەرزبێتەوەو لە خوا نزیك بیتەوە و لە رۆژی دواییشدا رزگارو سەرفرازو بەختیار بی، هیچ پێویست نی‌یە کە خۆت بمرێنی‌و واز لە ژیان بهێنی، چونکە یادی خوا لەگەڵ سوودو کەڵك وەرگرتن لە ژیانی ئەم جیهانەو خۆپاراستن لە بێ‌گوێی ئەو خوایەو شوێنکەوتنی یاساو بەرنامەکەی ئەو گەورەترین هۆی بەختیاری‌و رزگاری لەم ژیانەو لە ژیانەکەی تریشدا، هەروەها بەرنامەی ئیسلام خۆکوشتن‌و خۆسووتاندنی قەدەغەکردووە، وە پێت ئەڵێ: ئەو گیانەی کە پێت دراوە خوا بە سپاردە لای داناوی بۆ ئەوەی ماوەیەکی دیاری‌کراو بەکاری بێنی، بۆ ئەوەت نەدراوەتێ کە یاری پێ‌بکەیت‌و بێ‌سوودو کەڵك بەدەستی خۆت لەناوی ببەی.

## مافەکانی مەردم

بەرنامەی ئیسلام داوا لە مرۆڤ ئەکا کە پێویستە ئەم مافانەی خۆی بەشێوەیە جێبەجێ بکات کە نەبێ بەهۆی تیاچوون‌و لەناوبردنی مافی مەردم، چونکە ئەگەر ئارەزووی خۆی بەم شێوەیە جێبەجێ‌بکات خۆی خراپ‌و ناشیرین ئەکات‌و زیانیش بەیەکێکی‌تر ئەگەیەنێ، بۆیە دزی‌و تالآن کردن‌و بەرتیل‌و دەست پیسی‌و دووزمانی‌و سووخۆریی یاساغ‌و قەدەغە کردووە، چونکە ئەو کەڵك‌و سوودەی کە مرۆڤ لەم شتانەدا ئەیگاتێ لە رێگایەکەوە دەستی ئەکەوێ کە زیان ئەگەیەنێ بەیەکێکی‌تر، هەروەها ئاینی ئیسلام درۆکردن‌و لەپاش ملە دووان‌و قسە هێنان‌و بردنی قەدەغە کردووە، وە قومارو یانەسیب‌و شتی وای قەدەغە کردووە، چونکە سوودی ئەمانە بە زیانی هەزاران کەس تەواو دەبێ، هەروەها کرین‌و فرۆشتنی گۆترەو ئەو شتانەی کە زیان

تووشی لایەك ئەكات قەدەغەی كردووە لەبارەی داراییەوە، وە كوشتن‌و خراپەو ئاژاوە نانەوەی قەدەغەكردووە، چونكە بۆ هیچ كەس نی‌یە كە مرۆڤێ بكوژێ یان تووشی زیانی بكا بۆ ئەوەی سامانی دەست كەوێ یان رقی خۆی دامركێنێتەوە، هەروەها زیناو نێربازی قەدەغەكردووە چونكە ئەم كردەوانە رەوشتی مرۆڤ خراپ ئەكەن، وە تەندروستی تێك ئەدەن، وە لەلایەكی تریشەوە ئەبنە هۆی بلاوبوونەوەی بەرەڵلایی‌و بێ‌ئابڕوویی‌و داوێن پیسی لەناو كۆمەڵدا، وە لەدواییدا سەر ئەكێشێ بۆ گەلێ نەخۆشی كوشندەو تۆوی منداڵ خراپ ئەكات، وە ئاژاوەو نالەباری پەیدا ئەكا، وە پەیوەندی نێوان مرۆڤەكان تێك ئەداو بنچینەو بناغەی شارستانی و پێشكەوتن لە رەگ‌و ریشە دەرئەهێنێ.

ئەمانە چەند پەرژینێكن كە بەرنامەی ئیسلام لە ژیانی مرۆڤدا دروستی كردوون بۆ ئەوەی هیچ كەس دەستدرێژی نەكات بۆ سەر مافی كەسێكی‌تر یان هەندێ لەو مافانە ژێر پێ نەخات لەپێناوی مافەكانی خۆیدا، بەلام بۆ پێشخستنی شارستانی‌و بەختیاری ئادەمیزاد تەنها ئەوە بەس نی‌یە كە مرۆڤ زیانی بۆ كەس نەبێ، بەڵكو لەهەمان كاتدا پێویستە پەیوەندی مەردم لەناو یەكدا لەسەر شێوەو رێبازێك بێ كە یەكتریان خۆش بوێ‌و یارمەتی‌و كۆمەكی یەك بدەن بۆ بەرژەوەندیە كۆمەلایەتیە گشتیەكان، وا لەخوارەوە بەكورتی ئەو بنكەو رێبازانەت بۆ باس ئەكەین كە بەرنامەی ئیسلام بۆ پێكهێنانی ئەمە دایناوون‌و بڕیاری داوون:

١. پەیوەندی ئادەمیزاد لەسەرەتاوە لە ژیانی خێزانەوە دەست پێ‌ئەكات، بۆیە ئەتوانی پێش هەموو شتێ سەیری ئەم پەیوەندیە بكەیت و لێی بكۆڵیتەوە، خێزان ئەو كۆمەڵە بچوكەیە كە پێك دێ لە ژن‌و مێردو منداڵەكانیان، ئەوەی كە ئاینی ئیسلام ئەم خانووەی لەسەر دروست ئەكات ئەوەیە كەلەسەر مێرد پێویستە هەوڵ بدا بۆ بەخێوكردنی خێزان‌و پێویستیان جێبەجێ بكات‌و

پارێزگاریان بكات، وەلەسەر ئافرەتیش پێویستە كە ئیش و كاری ماڵ ببا بەڕێوە، وە بەجوانی خەریكی پێگەیاندن و پەروەردەكردن و بەخێوكردنی منداڵەكانیان ببێ وە ناو ماڵ رێك بخاو خۆشگوزەرانی لەماڵەوە ئامادەبكات، وە پێویستە منداڵەكانیش بەگوێی دایك و باوكیان بكەن و كاتێ گەورەبوون بەخێویان بكەن، وە بۆ بەڕێوەبردنی یاسای خێزان ئایینی ئیسلام دوو بڕیاری دەركردووە: یەكەمیان ئەوەیە مێرد لێپرسراوەو فەرمانبەری خێزانە، چونكە هەروەكو هیچ وڵاتێ بەبێ فەرمانبەر كاروباری ناڕوا بەڕێوە هەروەها ناگونجێ و رێك ناكەوێ كە خێزانیش بەبێ گەورەو لێپرسراو ئیشوكاری بڕوا بەڕێوە، وە ئاژاوەو تێك چوون ئەو خێزانە داگیر ئەكا كە ئەندامەكانی هەریەكە سەربەخۆو لێپرسراو نەبێ لە هیچ ئیش وكارێكدا، وە هۆی نەمانی ئاسایش و خۆشگوزەرانی لەو خێزانەدا، كەواتە پێویستە بۆ نەهێشتنی ئەم خراپەو گیروگرفتانە فەرمانبەرێك ببێ كە راستەوخۆ لێپرسراو بێ و بەڕێوەبردنی ئیشوكاری خێزانی بدرێتە دەست، دیارە لەناو ئەندامەكانی خێزانیشدا باشترین كەسێ بۆ ئەم مەبەستە پیاوە، چونكە هەر خۆی لێپرسراوە لە پارێزگاری و پێگەیاندن و پەروەردەكردنیان. وە بڕیاری دووەمیش ئەوەیە دوای ئەوە كە ئەركی ئیش وكاری دەرەوەی خستووەتە سەرشانی پیاو، بە ئافرەتیشی راگەیاندووە كە بەبێ پێویست نەچێتە دەرەوە، لەبەر ئەوە لە ئیشوكاری دەرەوە لێپرسراو نی‌یە بۆ ئەوەی بە هەموو ئارامی و دڵنیاییەكەوە كاروباری ماڵ ببا بەڕێوە، وە یاسای ماڵ و بەخێوكردنی منداڵان تێك نەچێ و ناڕێكی تێدا پەیدا نەبێ، بەڵام ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێ كە ئیتر ئافرەت نابێ بە هیچ شێوەیە لەماڵ بچێتە دەرەوە، بەڵكو هەر كە پێویستی هەبوو ئەتوانێ بچێتە دەرەوە، بەرنامەی ئیسلام لێرەدا بڕیاری ئەوەی داوە كە بنكەی ئیشوكاری ئافرەت بریتی‌یە لە ماڵ، وە پێویستە ئەو تواناو بەهرانەی كە پێی دراوە بەكاریان بێنێ بۆ رێكخستن و چاككردنی باری چۆنیەتی ژیانی ماڵەوە،

وە بەهۆی خزمایەتی و پەیوەندی ژن خواستنەوە شێوەی خێزان گەورەو فراوانتر ئەبێ، ئەوانەی کەبەم شێوەیە بەیەك ئەگەن بۆ چاككردن و رێكخستنی پەیوەندی نێوانیان وە بۆئەوەی کە کۆمەکی و یارمەتی یەك بدەن بەرنامەی ئیسلام هەندێ رێبازو بڕیاری جۆربەجۆری دانـاوە کە لەخوارەوە باسی هەندێکیان دەکەین:

أ. بەرنامەی ئیسلام هەندێ لەوانەی کە بەتێکەڵ لەگەڵ یەکتردا دەژین قەدەغەی کردووە کە یەکتر بخوازن، وەکو (دایك و کوڕ، باوك و کچ، مێردی دایك و کوڵەبەس، ژنی باوك و کوڕی مێرد، خوشك و برای پشتی یان شیری، مام و کچی برا، پووری باوکی و کوڕی برا، خاڵ و کچی خوشك، دایکی ژن و مێردی کچ، باوکی مێردو ژنی کوڕ. واتە زاواو خەسوو، بووك و خەزوور). وەهەندێ لە سوودەکانی ئەم قەدەغەیە ئەوەیە کە زۆر چاك وێنەی ئەمانە ئەتوانن پێکەوە بە پاك و خاوێنی بژین بەبێ ئەرك و گومان بردن، وە ژیانێکی پڕ لە خۆشەویستی و دڵسۆزی بەسەر بەرن.

ب. بەرنامەی ئیسلام دوای ئەم پەیوەندیانە ژن و ژن خواستنی لەناو ئەندامانی‌تری خێزاندا بڕیار داوە، بۆ ئەوەی خزمایەتیان زیاتر بکات و خۆشەویستی بەهێزتر بێ، ئەوانەی کەلە خورەوشتی یەکتر ئاگادارو شارەزان هەمیشە پەیوەندی ژن خواستن زیاتر ئەیان بەستێ بەیەکەوە، تا ئەوانەی کە یەکتر ناناسن و شارەزای یەکتر نین، گەلێ جار ئەبێ ژن خواستن لە ناو ئەوانەدا کە یەکتر ناناسن ئەبێ بەهۆی دوژمنایەتی و دوورکەوتنەوە لەیەکتر، بۆیە ئاینی ئیسلام ژن خواستنی نێوان ئەوانەی کە وەکو یەکن (ذوی الکف) بەباشتر دائەنێ لە ژن خواستنەکانی‌تر.

ج. لە نێوان خێزاندا دەوڵەمەندو هەژار، دەسەڵاتدارو بێ‌دەسەڵات هەیە، لەبەر ئەوە ئاینی ئیسلام بڕیاری داوە کە گەورەترین مافی مەردم بەسەر مەردمەوە بریتی‌یە لە مافی خزمایەتی کەلە بەرنامەی ئیسلامدا ناونراوە (صلة

الرحم)وه ئەم ناوە زۆر جار لـە قورئـان و فـەرموودەکانی پێغەمبـەردا دووبـارە کراوەتەوەو گرنگی دراوەتێ بەشێوەیە کە پچراندنی ئەم پەیوەندیەی بە تاوانی گەورە (الکبیرة) داناوە. ئەگەر یەکێ تووشی گیروگرفتێ یـان نـەبوونی هـات لەسەر خزمە دەسەلاتدارەکانی پێویستە کە دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەن، وە هـەروەها چاکـەو بەخشندەیی لەگـەڵ خزمـدا خراوەتـە پێـش هـەموو چاکـەو بەخشندەییەکی ترەوە.

د. بەرنامەی ئیسلام یاسای کەلـەپوور(قانون الأرث)ی وا داناوە هـەرکاتێ یەکێ بمرێ سامان و ماڵی لە شوێن بەجێ بمێنێ نابێ ئەو سامان و ماڵە لەیەك جێگـا کـۆ ببێتـەوە، بـەڵکو هـەموو خزمـێ بەشـی تایبـەتی بـۆ دانـراوە ئـەبێ بیدرێتێ، بۆ نمونە کوڕو کچ و ژن و مێردو باوك و دایك و براو خوشك نزیکترین خاوەن مافن لە مرۆڤەوە، بۆیـە بەرنامـەی ئیسـلام بەشـی ئەمانەی پێش بەشـی هەموو کەس باسکردووە، ئەگەر ئەمانە نەبوون کێ لە دوای ئەمانـەوە دێت لـە خزمایـەتیدا بەشـی خـۆی ئـەبات، بـەم شێوەیە سامانی یـەك پیـاو بـەش بـەش ئەکرێ لە نێوان خزمـەکانیدا، وە دوای مردنـی خـۆی کـەڵکی لـێ وەرئـەگرن، وە ئەم یاسای کەلەپوورە کە لە ئیسلامدا هەیە لـە هیـچ بەرنامەیـەکی کـۆن و تـازەدا نییەو دەست ناکەوێ، هەرچەند هەندێ لەگـەلانی سـەر زەوی ئـەمڕۆ ئەیانـەوێ ئەم ڕێبازە بگرنەبەرو بیکەن بەیاسای خۆیان، بەلام . بەداخەوە . موسوڵمانەکان خۆیـان لەبـەر نـەزانین و نـەفامی ئەیانـەوێ پێچەوانـەی ئەم یاسـایە بجوڵێنـەوە، لەگەلێ لە ناوچەکانی ئیسلامدا . بەتایبەتی لادێکان . کچەکان بێبـەش کـراوون لەبەشی خۆیان، کە ئەمەش گەورەترین تاوانەو پێچەوانەی فەرمان و بڕیارەکانی قورئانە.

٢. وە لەدوای پەیوەندیەکانی خێزان پەیوەندی دۆستایەتی و دراوسێیەتی و هاوەڵی و هاوولاتی دێتە پێشەوە، وە ئەوانەی لە چۆنیەتی ژیان و ئیش وکارا وەکو یـەکن و لەیەکەوە نزیکن، وە بەرنامـەی ئیسـلام لـێرەدا فـەرمانی داوە کـە

پێویستە بەڕاستی و داپەوەری و ڕەوشت جوانی لەگەڵ یەکدا بژین و ڕەفتار بکەن، وە هیچ کامیان ئازاری کەسیان نەدەن، وە قسەی خراپ دەربارەی یەک نەکەن، وە لەناو خۆیاندا کۆمەکی و یارمەتی یەك بدەن، وەسەر لە نەخۆشی یەکتر بدەن و شوێنی تەرمی مردووەکانیان بکەون، کەیەکێکیان تووشی گیروگرفتێ بوو پێویستە سەری لێبدەن و دڵخۆشی بکەن، دەستگیرۆیی هەژارو لێقەوماوو لێکەوتوو بکەن، بە نهێنی بێئەوەی کەس پێیان بزانێ، ئاگایان لە هەتیو و بێوەژن بێ و بەزەییان پێیانا بێتەوە، وە ئەبێ خواردن بدەن بەبرسی و ڕووتەکان پۆشتە بکەنەوە، وە یارمەتی بێئیش بدەن هەتا ئیشی دەست ئەکەوێ، وەئەگەر خوای گەورە سامان و ماڵێکی پێبەخشین نابێ لە ڕابواردنی بێهوودەو شتی خراپدا لەناوی بەرن و بەفیڕۆی بدەن، وە بەرنامەی ئیسلام قەدەغەی کردووە کە قاپ و قاچاغ لە ئاڵتوون و زیو دروست بکرێ و بەبەرگی ئاوریشم خۆت برازێنێتەوە، چونکە ئەو سامانەی کە لەوانەیە بەسەدان و هەزاران کەس پێی ڕابوێرن و کەڵکی لێوەرگرن و پێی بژین نابێ تەنیا کەسێ بەئارەزووی خۆی داگیری بکات و پێی ڕابوێرێ، وە زۆر تاوانە ئەو ماڵەی کە هەزاران کەس بتوانن پێی بژین و نەمرن لە گیرفانی تۆدا لە شێوەی ئاڵتوون یا شتێکی بەنرخدا بکەوێ، یان شتێکی جوان و نایاب بێ و لەسەر مێزەکەت دانرابێ یان جوانی‌یەك بێ ژوورەکەتی پێبرازێنیتەوە، یان ئاگرێکی دەستکردبێ و هەڵی‌کەی بە ئاسماندا، بەڵام مانای ئەمەش ئەوە نی‌یە کە ئاینی ئیسلام هەموو سامانت لێ بسەنێتەوە، بەڵکو ئەوەی کە بە ئیش‌وکار دەستت کەوتووە یان بە کەلەپوور بۆت ماوەتەوە مافی خۆتەو ئەتوانی بەپێی پێویستی خۆت کەڵك و سوودی لێ وەرگری، وە بۆت هەیە لە جل‌وبەرگ و پۆشاك و ولاغی سواری و ئۆتۆمبێل و جێگای دانیشتن و خواردنتا نیشانەی بەخششەکانی خوای پەروەردگارت پێوە دیاربێ، بەڵام مەبەستی ئامۆژگاری و بڕیارەکانی ئیسلام ئەوەیە کە بەپاکی و ژیانێکی ڕاست بژیت، وە زۆر شتی بێهوودەو بێ

کەڵك بەسەر خۆتەوە بارنەکەیت، وەلەوەی کە خوا پێی بەخشیوی مافی خزم و دراوسێ و ناسراوو هاوڵاتی و رۆڵەکانی باوکە گەورەمان (ئادەم) پێغەمبەر پارێزگاری بکەی و لەناوی نەبەی.

٣. بۆت هەیە و ئەتوانیت لەم سنوورە تەسك و تروسکە دەرچی و سەیری ئەو خێزانە گەورەو بەربڵاوە بکەی کە هەموو موسوڵمانانی جیهان ئەگرێتەوە، وە بێگومان ئاینی ئیسلام لەم خێزانەدا ئەوەندە بڕیاری جوان جوانی داناوە کە موسوڵمانان وا لێ ئەکات هەمیشە کۆمەکی و یارمەتی یەکتر بدەن لەسەر چاکەو خواناسی، وە لەسنووری تواناندا بەهیچ شێوەیە ماوە نادات خراپەکاری لە زەویدا سەر بهێنێتە دەرەوەو پەیدا ببێ، وەلەخوارەوە هەندێ لەم بڕیارانە پێش چاو ئەخەین:

أ. بۆ ئەوەی خوڕەوشتی کۆمەڵایەتی لە ناوماندا پارێزراو بێ، ئاینی ئیسلام داوامان لێ ئەکات کە پیاوان و ئافرەتان بە شێوەی بەرەڵایی و ناڕاست تێکەڵ بەیەك نەبن، با ئافرەتان شوێن و باری ژیانیان جیا بێ لە پیاوان، وە ئافرەتان ئەتوانن بیری خۆیان زیاتر ئاراستە بکەن بۆ بەڕێوەبردنی ئەرك و پێویستیەکانی ژیانی خێزان، هەرکاتێ پێویستیان هەبوو بە چوونەدەرەوە نابێ خۆیان دەربخەن و خۆیان بڕازێننەوە، با بەبەرگی ئاسایی خۆیانەوە دەرچن و لەشیان دەرنەخەن و دەم و چاوو دەستیشیان داپۆشن، مەگەر بۆ پێویستیەك، ئەمەیە کە پێی دەوترێ (الحجاب) لە بەرنامەی ئیسلامدا، وەلەلایەکی ترەوە ئاینی ئیسلام قەدەغەی کردووە کە پیاوان تەماشای ژنانی مەردم بکەن، وەئەگەر رێکەوت چاویان پێکەوت با بەزوترین کات چاویان لادەن و درێژەی پێ نەدەن، چونکە ئەمە لەو شتانەیە کە رەوشتی پێ سووك دەبێت، خۆ ئەگەر هەوڵی تێکەڵییان بدەن ئەوە زیاتر ناشیرین و سووکی یە بۆیان، وە پێویستە لەسەر هەموو پیاوو ئافرەتێك کە پارێزگاری رەوشتی خۆی بکات و ماوە نەدات بەهیچ جۆرێ لە دڵیا نیازی خراپ پەیدا ببێ و

لەچوارچێوەی ژن و مێردی دەربچێ چ جای ئەوەی کە هەوڵی بدات و کۆشش بکات..

ب. هەروەها بۆ ئەوەی کە ڕەوشتی کۆمەڵایەتی پارێزراو بێ، ئاینی ئیسلام قەدەغەی کردووە کە پیاو نێوانی ناووك و ئەژنۆی دەربخات و ئافرەتیش بێجگە لە دەست و دەموچاوی دەربخات هەتا بۆ نزیکترین خزمی خۆشی، ئەمەیش ئەوەیە کە لەبەرنامەی ئیسلامدا پێی دەوترێ (الستر)، وە پێویستە هەموو ئافرەت و پیاوێ پارێزگاری بکات، وە بەرنامەی ئیسلام بەم شێوەیە ئەوی شەرم زیاتر بێ لەناو مەردمدا بێناموسی و خراپەو بێڕەوشتی بڵاونەبێتەوە.

ج. هەرچی یاری و سەماکردنێك کە ڕەوشتی پێ تێك بچێ و ئارەزووی پێهەڵبستێ و کاتی پێ بکوژرێ و تەندروستیی پێ تێك بچێ ئاینی ئیسلام نایەوێ، وە قەدەغەی کردووە، بێگومان یاری کردن شتێکی پێویستە لە جێگای خۆیدا، وە بۆ گورج کردنەوەی گیان و بیری مرۆڤ دوای ماندوو بوون و ئیشکردن. بەڵام نەك یاری و سەماکردنێ کە گیان و بیری مرۆڤ پیس و چڵکن کات و ڕەوشتی نزم کاتەوە، خۆ ئەو سەماو یاریانەی کە بەتایبەتی دروست کراوون بۆ ئەوەی تاوان و بێڕەوشتی نیشان بدەن و مەردم بانگ بکەن بۆ دەرچوون لە ڕەوشتی جوان، ئەوانەی خوڕەوشتی گەل بەتەواوی تێك ئەدەن و لەناوی ئەبەن، هەرچەند لە دیمەندا جوان بن و دڵی مەردمیان پێ خۆش ببێ.

د. وە بۆ ئەوەی کە یەکێتی موسوڵمانان و بەختیاری گشتیان بمێنێتەوە، ئاینی ئیسلام داوایان لێ ئەکات کە خۆیان بپارێزن لە دوبەرەکی و ئەو شتانەی کە ئەبنە هۆی بەش بەش و لەت بوونیان، وەئەگەر لە شتێکا جیاوازی کەوتە نێوانیان با بە زووترین کات بیگێڕنەوە بۆلای پەڕاوی خواو فەرموودەی پێغەمبەرﷺ، وەلەسەر بڕیاری ئەوان بە هەموو دڵسۆزی و نیازی خاوێنەوە کۆببنەوەو ئاژاوەو کینەبەری لەناو یەکدا نەکەن، وەیارمەتی یەك بدەن لەسەر

ئـەو کردەوانـەی کـە رزگـاریو بـەختیاری گشـتی تێدایـە، وە بـا بـەگوێی کاربەدەستەکانی خۆیان بکەنو لە پیاو خراپو ئەوانەی کە ئاژاوە ئەنێنەوە دووربن، وە هێزو توانای خۆیان بە ئاژاوەو جەنگی ناوخۆ لەناو نەبەن.

ه. موسوڵمانان بۆیان هەیە و ئەتوانن ولاتێ زانیاری و هونەری بەکەڵکی هەبێ بڕۆن بۆ خوێندنو وەرگرتنی، با ئەو ولاتەش ولاتی ئیسلام نەبێ، بەڵام نابێ ژیانی خۆیان وەکو ژیانی بێگانە لێ بکەن، چونکە هیچ گەلو نەتەوەیە وەکو گەلو نەتەوەیەکیتر نییەو لاسایی ناکاتەوە، مەگەر کاتێ دان بنێ بە هیچو پووچیو بێهێزی خۆیداو بە پێشکەوتنو بەرزیو سەرکەوتنی ئەو گەلەدا کە شوێنی کەوتووە، ئەمەش ناشیرینترین و نزمترین بەندایەتیو شوێنکەوتنە، وە داننانێکی تەواوە بە سووکیو بێنرخی خۆیدا، بەهەموو ئەنجامی ئەمەش ئەوەیە، ئەو نەتەوەیە کەلاسایی نەتەوەکەی تر ئەکاتەوەو شوێنی ئەکەوێ نرخی نامێنێو شارستانیو جێگای شانازی لەناو ئەچێ، بۆیە پێغەمبەری خواﷺ بەتوندی یاساغو قەدەغەی کردووە کە موسوڵمانەکان شوێنی گەلو نەتەوە بێگانەکان بکەونو شارستانیو جۆری ژیانیان وەرگرن، ئەو کەسەی کەمێ ژیریی تێدابێ ئەزانێ کە هێزو نرخی هیچ گەلێ بە جلوبەرگو جۆری ژیان نییە، بەڵکو بەزانیاری و رێکخستنی هێزەکانو کردەوەیە، کەواتە ئەو کەسەی کە بە هێزی و تەواوی سەرکەوتنی ئەوێ با لەنەتەوەکانی ترەوە شتێکی ئەوتۆ فێر ببێو وەربگرێکە ببێتە هۆی سەرکەوتنو تواندنەوەیە لەناو گەلانی تردا بەشێوەیە کە نیشانەی خۆیەتی لەناو بچێو نەمێنێ وە موسوڵمانەکان قەدەغەکراوون لەوەی کە بەدەمارگیریو بیرێکی تەسکەوە لەگەڵ نەتەوەکانی تردا بژینو رەفتار بکەن، وەگاڵتە بەبیروباوەڕو پەرستراوو ئاینەکانیان بکەنو جنێویان بدەنێ، وە نابێ دوژمنایەتی لە موسوڵمانەکانەوە دەست پێبکات، هەتا ئەوان رێکەوتنو ئاسایشیان بوێ لەگەڵ موسوڵمانەکاندا دەستدرێژی نەکەن بۆ سەر مافەکانیان.

پێویستە ئەمانیش ڕێگای ئاشتیو ئاسایش لەگەڵ ئەواندا بگرن، ئەوەی کە مەردیو ڕەوشت بەرزی ئیسلام لەسەرمان پێویست ئەکات ئەوەیە کە بەوپەڕیو هەستی بەزەییو خۆشەویستییەوە لەگەڵ گەلو نەتەوەکانی تردا ڕەفتار بکەین، وە بە پێچەوانەی بەرنامەو بڕیارەکانی ئاینی ئیسلامە کە بەرامبەر بە نەتەوەکانی تر دەمارگیرییو توندوتیژی بکەین، چونکە مرۆڤی موسوڵمان بۆیە هاتووەتە جیهانەوە کە چاوی لێ بکرێو ببێ بەسەرمەشق لە ڕەوشت جوانیو باشیو بەرزیدا وە بۆ ئەوەی کە دڵی بێگانەکان ڕابکێشێ بەلای ئیسلامدا تا ئەوانیش ئەو بیروباوەڕو ڕەوشتە بەرزە هەڵگرنو بڕوای پێ بکەن.

## مافی دروستکراوەکانیتر

ئەمەو ئێستاش ئەمانەوێ جۆری چوارەم لە مافەکان باس بکەین: بێگومان خوای پەروەردگار ئادەمیزادی گەورە کردووە بەسەر زۆر لە دروستکراوەکانی خۆیدا، وە ڕێگای داوە بەهۆی ژیریو توانایەوە زاڵ ببێ بەسەریانداو قازانجو سوودیان لێ وەرگرێ، وەئەمەش بەشێکە لە مافی دیاری کراوی خۆی بەپێی ئەوە کە ئادەمیزاد بەڕێزترینو گەورەترین دروستکراوێکە لەم زەویەدا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا خوای پەروەردگار هەندێ مافی بەسەر ئادەمیزادەوە داناوە بۆ ئەم دروستکراوە، یەکێ لەو مافانە ئەوەیە کە نابێ بەبێ پێویست ئازاری بدا، وەیا لەناوی ببا یان زیانی پێ بگەیەنێ، وەئەگەر هەر پێویست بوو زیانی پێبگەیەنێ ئەبێ لەرادەیەکدا بێ کە لەوە زیاتر چارە نەبێ، وە بۆ بەکارهێنانو ژێربارکردنی پێویستە باشترینو ڕاسترین ڕێگا بگرێتە بەر وە بەرنامەی ئیسلامیش پڕیەتی لەم جۆرە مافو بڕیارانە، بۆ نمونە ماوەی هیچ مرۆڤێ نادا کە زیندەوەر بکوژێ مەگەر بۆ خواردن یان بۆ ئەوەی خۆی لە زیانی بپارێزێ، وەقەدەغەی کردووە کە بە گاڵتەو ڕابواردن بکوژرێ، یان ئازار بدرێ، وە بۆ کوشتنی باشترین ڕێگای بۆ داناوە کە بریتییە لە (سەربڕین)، وە هەموو

ڕێگایەکی تر جگە لەم ڕێگایە ئەگەر ئازاری کەمتر بێ بۆ زیندەوەرەکە بۆ گۆشتەکەی زیانی هەیە، وە ئەگەر پارێزگاری گۆشتەکەی زیاتر تێدابێ ئازاری زیندەوەرەکەی زیاتر تێدایە، وە ئاینی ئیسلام لە هەردوو ڕێگاکە خۆی پاراستووە. هەروەها قەدەغەی کردووە کە بە سزاو دڵ ڕەقی زیندەوەر بکوژرێ. وە بۆیە ڕێگای کوشتنی دڕندەکان و زیندەوەرە ژەهراویەکان دراوە چونکە نرخی مرۆڤ زیاترە لە ژیانی ئەم جۆرە زیندەوەرانە، لەگەڵ ئەوەشدا نابێ بە سزاو ئازار بکوژرێن، وە ئەم زیندەوەرانەی کە ئیشیان پێ ئەکەین باریان پێ ئەکێشین، نابی برسی و تینوو بکرێن، وە نابێ زیاتر لە توانای خۆیانیان پێ بکەین، وە نابێ بە بێ پێویست باڵندەکان لە بەندیخانەدا بهێڵینەوە، بەڵکو چ جای زیندەوەر نابێ لە خۆمانەوە دارو درەخت ببڕین و لەناوی ببەین، هەرچەند بۆمان هەیە گوڵ و بەروبومەکانیان لێ بکەینەوە، بەڵام بۆمان نییە کە بیانبڕین، وە یا برینداریان بکەین بەبێ پێویست، بەڵکو چ جای ئەمانە ئەو شتانەش کە بێ گیانن نابێ بە بێهوودە لەناویان بەرین، بۆ نمونە نابێ لە خۆمانەوە ئاو برێژین و لەناوی بەرین بەبێ پێویست.

## بەرنامەیەکی جیهانی و هەتا هەتایی

ئەمەی کە تا ئێستا بۆمان باسکردی تەنیا کورتەیەك بوو لە بڕیارو ڕێبازەکانی ئەم بەرنامە سپی و بەنرخە، ئەو بەرنامەیەی کە پێغەمبەرمان محمدﷺ پێی نێرراوە بۆلای ئادەمیزاد هەتا هەتایە، وەلەم بەرنامەیدا جیاوازی نییە لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤێکی تردا، مەگەر بە بڕواو کردەوە، وە لەڕاستیدا ئەو بەرنامەو ئایینانەی کە مرۆڤێکی تر بە جیاواز دائەنێن بە هۆی جیاوازی ڕەگەز وەیا نیشتمان وەیا ڕەنگ و زمانەوە ناتوانن ببن بەبەرنامەی جیهان، چونکە هەرگیز مرۆڤ لە ڕەگێکەوە نابێ بە ڕەگێکی تر، هەروەکو ناگونجێ هەموو مەردمی سەرزەوی لە ناوچەیەکی تایبەتیدا کۆببنەوەو بۆئەوەی هەموویان یەك نیشتمانیان ببێ، هەروەها ڕەنگە جیاجیاکانی سروشت وەك

ڕەشی حەبەشیو زەردی چینیو سپیەتی فەرەنسی ناگۆڕێن و لە سروشتی خۆیان لاناچن، بۆیە ئەم جۆرە ئایین و بەرنامانە هەر لەناو گەلو نەتەوەیەکی تایبەتدا ئەبنو گەشە ئەکەن، وە بەرامبەر بەم هەموو ئایینو بەرنامانە ئایینی ئیسلام بەرنامەیەکی جیهانی هێنا کە هەرکەس بڕوای بە ڕستەی (لا اله الا الله) ببێ ئەچێتە ناو گەلو نەتەوەی ئیسلام، وە ئەو مافانەی کەلەم بەرنامەیەدا هەیە بۆ ئەویشە بەبێ جیاوازی، چونکە لەم بەرنامەیەدا گوێ نادرێتە نەریتو زمان یان ڕەنگو نیشتمان.

وەئەم بەرنامەیە بەرنامەیەکی هەمیشەییو هەتاهەتاییە، فەرمانو ڕێبازەکانی لەسەر خوڕەوشتی گەلێکی تایبەتی دانەنراوەو لەسەر چۆنیەتی ژیانی چەرخێکی دیاریکراو دانەنراوە، بەڵکو لەسەر بنچینەی سروشتێکی ئەوتۆ دانراوە کە ئادەمیزادی لەسەر دروستکراوە، وەلەبەر ئەوەی لە هەموو کاتێکدا و لە هەموو بارێکدا ئەم سروشتە لە مرۆڤدا ناگۆڕێو وەکو خۆی ئەمێنێتەوە ئەو ڕێبازو بڕیارانەش کەلەسەری دانراوە هەروا لە هەموو کاتو چەرخێکدا ئەمێنێتەوەو بۆی دەست ئەدا.

*وە لە کۆتایی هەموو وتەیەکدا ئەڵێین: سوپاسو ستایش هەر بۆ خوای پەروەردگارە.*

**ماموستا (ابو الاعلى المودودى) له چەند دێرێكدا:**

- لەساڵی ١٣٢١ك ١٩٠٣ز لە شاری (ئورنــگ ئابـاد) لـەدایك بـووە كـە شـارێكی ویلایەتی حەیدەر ئابادی ئیسلامیە لە باشوری نیمچە كیشوەری هیندی.
- لەساڵی ١٣٥٢ك ١٩٣٢ز گۆڤاری (ترجمان القران)ی بـەرێوە بـردووە كـە مانگانـە دەردەچوو، دەستی كردووە بە بڵاوكردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی.
- لەساڵی ١٣٦٠ك ١٩٤١ز كۆمەڵی ئیسلامی (الجماعة الإسلامية)ی دامەزراند.
- لەساڵی ١٣٩٩ك ١٩٧٩ز كۆچی دوایی كرد.
- زیاتر لە نیو سەدە لەپێناو بانگەوازی ئیسـلامی كۆششـــی كـردوە، واتـە لەسـەرەتای چارەكی دووەمی سەدەی بیستەمی زایینی تا سەرەتای چارەكی كۆتایی سەدەی بیست.

**دانراوەكانی ماموستا مەودودی:**

١- تفهيم القرآن (٦ بەرگ).
٢- ترجمة القرآن بەزمانی ئوردی
٣- مبادئ أساسية لفهم القرآن.
٤- القرآن والحديث.
٥- فضائل القرآن.
٦- المصطلحات الأربعة في القرآن.
٧- كتاب الصوم.
٨- مكانة السنة في التشريع.
٩- تفهيم الحديث.
١٠- سيرة سيد العالم.
١١- النبوة المحمدية في محكمة العقل.
١٢- رسالة السيرة النبوية.
١٣- سيرة الرسول ﷺ.
١٤- سيرة خاتم المرسلين.
١٥- السيرة الطاهرة.
١٦- القرآن والرسول.
١٧- سيد العالم.
١٨- مبادىء الإسلام.
١٩- الخطب.
٢٠- نظرة فاحصة على العبادات الإسلامية.
٢١- خطب الحرم الشريف.
٢٢- الإسلام والجاهلية.
٢٣- طريق السلام.
٢٤- الحضارة الإسلامية.
٢٥- الدين القيم.
٢٦- البعث بعد الموت.
٢٧- مسألة الجبر والإختيار.
٢٨- في محكمة العقل.
٢٩- الدعوة الإسلامية ومتطلباتها.
٣٠- الأسس الأخلاقية للحركة الإسلامية.
٣١- الجهاد في الإسلام.
٣٢- الجهاد في سبيل الله.
٣٣- تجديد الدين وإحيائه
٣٤- شهادة الحق.

٣٥- الصفات اللازمة للعاملين في مجال الدعوة الإسلامية.
٣٦- الشروط اللازمة لنجاح الحركة الإسلامية.
٣٧- واقع المسلمين وسبيل النهوض بهم.
٣٨- الجماعة الإسلامية.
٣٩- دعوة الجماعة الإسلامية.
٤٠- دور المرأة المسلمة في الحركة الإسلامية.
٤١- مصدر قوة المسلم.
٤٢- ماهي الدعوة الإسلامية.
٤٣- مستقبل الحركة الإسلامية في الهند.
٤٤- الدعوة الإسلامية ومنهجها.
٤٥- منهج الحركة الإسلامية للمستقبل.
٤٦- الجماعة الإسلامية خلال ٢٩ عاما.
٤٧- تذكرة دعاة الإسلام.
٤٨- العلم والعمل.
٤٩- هلموا نقوم بتغيير هذا العالم.
٥٠- الحركة الإسلامية دعوتها وتأريخها.
٥١- تقرير عن الجماعة الإسلامية (٦ بهرگ).
٥٢- كيف تقام الحكومة الإسلامية.
٥٣- نظرية الإسلام السياسية.
٥٤- استفتاء ذوبال.
٥٥- الشريعة الإسلامية وطرق تنفيذه في باكستان.
٥٦- أسس الدستور الإسلامي في القرآن.
٥٧- تدوين الدستور الإسلامي.
٥٨- عقوبة المرتد في الشريعة الإسلامية.
٥٩- حقوق أهل الذمة في الدولة الإسلامية.
٦٠- المقترحات الدستورية.
٦١- حقوق الإنسان الأساسية.
٦٢- حول تطبيق الشريعة الإسلامية في باكستان.
٦٣- نظام الحياة في الإسلام.
٦٤- الخلافة والملك.
٦٥- الإسلام والديموقراطية العلمانية.
٦٦- المطالبة بإقامة النظام الإسلامي.
٦٧- نظام الحياة للإسلام ومبادئه الأساسية.
٦٨- الدولة الإسلامية.
٦٩- حقوق الإنسان الأساسية في الإسلام.
٧٠- مفاهيم إسلامية حول الدين والدولة.
٧١- نظرية الإسلام وهديه في السياسة والقانون والدستور.
٧٢- معضلات الإنسان الإقتصادية وحلها في الإسلام.
٧٣- أسس الإقتصاد بين الإسلام والنظم المعاصرة.
٧٤- الربا.
٧٥- مسألة ملكية الأرض في الإسلام.
٧٦- مبادئ الإقتصاد في القرآن.
٧٧- مبادئ الأساسية للأقتصاد الإسلامي.
٧٨- الرأسمالية والشيوعية.
٧٩- الإسلام والعدالة الإجتماعية.
٨٠- نظام الأقتصاد الإسلامي.
٨١- نظرية الإسلام الأخلاقية.
٨٢- الصلاح والفساد.
٨٣- الإسلام والعناية بتزكية النفس.
٨٤- الحجاب.

٨٥- حقوق الزوجين.
٨٦- حركة تحديد النسل في الميزان.
٨٧- الإسلام وتنظيم الأسرة.
٨٨- مسألة اللباس.
٨٩- مسألة تعدد الزوجات.
٩٠- منهج جديد للتعليم والتربية.
٩١- المنهج الإسلامي للتعليم وطرق تنفيذه في باكستان.
٩٢- منهج التعليم الإسلامي.
٩٣- خطبة توزيع الشهادات.
٩٤- التعليمات.
٩٥- نحن والحضارة الغربية.
٩٦- الإسلام اليوم.
٩٧- المحاضرات في اوروبا.
٩٨- الإسلام في مواجهة التحديات المعاصرة.
٩٩- واجب الشباب المسلم اليوم.
١٠٠- تحديات العصر الجديد والشباب.
١٠١- دور الطلبة المسلمين في بناء مستقبل العالم الإسلامي.
١٠٢- دور الطلبة في بناء مستقبل دولة باكستان الإسلامية.
١٠٣- التصريحات.
١٠٤- بين يدي الشباب.
١٠٥- مسألة الخلافة.
١٠٦- مجازر اليونانيين في سمرنا.
١٠٧- النشاطات التبشيرية في تركيا.
١٠٨- قضايا الداخلية والخارجية.
١٠٩- بين الدعوة القومية والرابطة الإسلامية.
١١٠- أضواء على حركة التضامن الإسلامي.
١١١- مأساة الشرق الأقصى.
١١٢- فاجعة المسجد الأقصى.
١١٣- قضية كشمير المحتلة.
١١٤- نحن وبنغلاديش.
١١٥- عرض موجز للوضع الذي تعيش فيه الأقلية الإسلامية في الهند.
١١٦- قضايا إسلامية هامة تنتظر الحلول.
١١٧- طائفة من قضايا الأمة الإسلامية في القرن الحاضر.
١١٨- المسألة القاديانية.
١١٩- ختم النبوة.
١٢٠- البيانات.
١٢١- التعليق على تقرير القاضي محمد منير حول الأضطرابات لعام٩٥٣م.
١٢٢- مكانة السنة في التشريع.
١٢٣- إثبات الذبح بآيات الذبح.
١٢٤- الذبح في محكمة العقل والشريعة.
١٢٥- بين المودودي والبابا.
١٢٦- مسألة القومية.
١٢٧- حركة تحرير الهند والمسلمون.
١٢٨- النشاط الأنتخابي.
١٢٩- الأنتخابات المختلطة... لماذا لا؟
١٣٠- الحركة لإعادة الديمقراطية.
١٣١- مقتضيات الحرية والإسلام.

١٣٢- التعليق على التوصيات الدستورية.

١٣٣- تحليل لأوضاع باكستان الشرقية.

١٣٤- التفهيمات.

١٣٥- الرسائل والمسائل.

١٣٦- المقابلات الصحفية (چەند چاوپێکەوتنێکە کە لەگەڵ مامۆستا مەودودی سازدراوە، بەڕێز أبو طارق نوسیویەتیەوەو بڵاوی کردۆتەوە).

١٣٧- المحاضرات (چەند موحازەرەیەکی مامۆستا مەودودیە، مامۆستا ثروت صولت نوسیویەتیەوەو بڵاوی کردۆتەوە).

١٣٨- الرسائل.

١٣٩- رسائل في الزنزانة.

١٤٠- الخطب الأذاعية.

١٤١- في جلسات الأستاذ المودودي العصرية.

١٤٢- كسوة الكعبة المشرفة تأريخا وحكمها الشرعي.

١٤٣- الشخصيات الإسلامية المعاصرة.

١٤٤- المراسلة بين الأستاذ المودودي والسيدة مريم جميلة.

١٤٥- مبادئ الإسلام الأقتصادية والسياسية.

١٤٦- الإمامان الجليلان أبو حنيفة وأبو يوسف.

١٤٧- اليهود والنصارى.

١٤٨- الى أي شيء يدعو الإسلام.

١٤٩- ذبائح أهل الكتاب.

١٥٠- الدولة الأصفية والإستعمار البريطاني.

١٥١- السلاجقة.

١٥٢- تأريخ الدكن السياسي.

١٥٣- الأخلاق الإجتماعية وفلسفتها.

**ئەو پەرتوکانەی مامۆستا مەودودی لە عەرەبیەوە وەریگێڕاوە بۆ سەر زمانی ئوردی:**

١- الإسلام والإصلاح. (شيخ عبدالعزيز جاويش).

٢- تحرير المرأة (قاسم أمين).

٣- تأريخ الإسلام (ابن خلكان).

٤- الأسفار الأربعة (شيخ صدرالدين الشيرازي).

## ئەم کتێبە:

- یەکەم جار لەساڵی ١٩٣٧ دەرچو، لەجیهاندا پێشوازیەکی گەرمی لێکرا و ئامێزی بۆ کرایەوە، لەبەر گرنگی و بایەخیەکەی تا ئێستا بۆ سەر (٣٠) زمان وەرگێڕدراوەتەوە.
- زانیاریە سەرەتاییەکانی سەبارەت بە ئیسلامی لەخۆ گرتوە، بەشێوازێکی ئاسان و سەرنج راکێش نوسراوە تاوەکو مسوڵمانان بەگشتی تێبگەن ئیسلام چیەو پێویستیەکانی چیە.
- کاتێ خوێنەر ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە تا تەواوی نەکات ناتوانێ دەستی لیٚ هەڵگرێ.
- ئەوە دەسەلمێنێ کە ئیسلام تەنها لە چەند رێورەسم و دروشمێك پێك نەهاتوە، بەڵکە ئیسلام ئایینێکی تێرو تەواو و مەنهەجی ژیانە.
- سەرکەوتوترین نوسراوە کە تێگەیشتنێکی راست و دروست سەبارەت بە ئیسلام بەدەست دەدات.
- لە ولاتە رۆژئاواییەکان رەواجێکی زۆر و کاریگەریەکی بەهێزی هەبوە، تەنانەت بە خوێندنەوەی: ژمارەیەکی باش لە نامسوڵمانان خوا هیدایەتی داون و ئامێزیان بۆ ئیسلام کردۆتەوە، سەدەها هەزار مسوڵمانیش بەهۆیەوە متمانەیان بە ئیسلام بۆ گەڕایەوە.
- لە زمانی عەرەبیەوە بۆ ئەم زمانانە وەرگێڕدراون:

(کوردی، ئینگلیزی، بەنگالی، فارسی، هیندی، تورکی، ئەندۆنیسی، سەواحیلی، فەرەنسی، هاوسە، ئەڵمانی، ئەسپانی، یابانی، سندی، بەشتویە، مالیباری، هۆڵندی، بورتگالی، کۆری، روسی، کەجراتی، تاملی، مالیزی و زمانە جیاجیاکانی تری جیهان.)

دیارە پێشتر لە ساڵەکانی شەست دا بەڕێز مامۆستا عومەر رێشاوی و مامۆستا جەعفەر مستەفا بەناوی خوازراوی (مستەفا عەبدوللا) هەڵسابون بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە گران بەهایە و لە ساڵی (١٣٩٠ك ١٩٧٠ز) بڵاوکرایەوەو کەوتە بەر دیدی خوێنەری مسوڵمانی کورد.

هەڵبەت ئەمە کارێکی پیرۆز و بەهادارە و شایەنی دەست خۆشی لێکردنــە، خـوای بەخشـندە پاداشتیان بە بەهەشتی رازاوەو نەبڕاوە بداتەوە.

جا لەبەر ئەوەی ئەم کتێبە جیاکارەو کاریگەریی و رۆڵی خـۆی هـەبوەو هەیـە لەسـەر هـزری هاوچەرخ و رابونی ئیسلامی، زۆر بە پێویستی دەزانین لەبەرگ و چاپێکی جوانتر و قەشـەنگتر لەوەی پێشو کە بە سادەیی چاپکرابو، چاپی بکەینەوەو چـاوی مسـوڵمانانی کوردسـتانی پـێ گەش ببێتەوە.

هەر مـسوڵمانێکیش خۆی بـە ئـەندامێکی رابونـی ئیسـلامی دەزانـێ و دەیـەوێ بانگـەوازی ئیسلامی بەرەو پێش بچێ و رەگ دابکوتێ، با ئەم کتێبە بخوێنێتەوەو خۆی بە زانیاریـەکانی بەهرەمەند بکات و گومانی گومانباران بڕەوێنێتەوەو روی راسـتەقینەی ئیسـلام پیشان بدات.

بە ئومێدی ئەوەین خوای گەورە ئەم کارە پیرۆزە پیرۆزتر بکات و لەئێمەش قبوڵ بکات.

**نوسینگەی تەفسیر**

# پێڕست

# له بڵاوکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر

## زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

| ت | اسم الكتاب | المؤلف | ناوی کتێب | وەرگێر | مێژوو |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | معالم في الطريق | سيد قطب | مەشخەڵی ڕێ | کرێکار | ١٤٢٠ |
| ٢ | الله ﷻ | سعيد حوى | خودا | سۆران | ١٤٢٠ |
| ٣ | العقيدة في الله | عمر سليمان الأشقر | بیروباوەڕبون بەخوا | ئارامی گەلاڵی | ١٤٢٠ |
| ٤ | عالم الملائكة الأبرار | عمر سليمان الأشقر | جیهانی فریشتان | ژیوانی گەلاڵی | ١٤٢٠ |
| ٥ | عالم الجن والشياطين | عمر سليمان الأشقر | جیهانی جنۆکەو شەیتانان | ژیوانی گەلاڵی | ١٤٢٠ |
| ٦ | الرسل والرسالات | عمر سليمان الأشقر | پەیام و پەیامبەران | ئارامی گەلاڵی | ١٤٢٠ |
| ٧ | القيامة الصغرى | عمر سليمان الأشقر | قیامەتی گچکە | ژیوانی گەلاڵی | ١٤٢٢ |
| ٨ | القيامة الكبرى | عمر سليمان الأشقر | قیامەتی گەورە | ئارامی گەلاڵی | ١٤٢٢ |
| ٩ | الجنة والنار | عمر سليمان الأشقر | بەهەشت و دۆزەخ | ژیوانی گەلاڵی | لەژێر چاپە |
| ١٠ | القضاء والقدر | عمر سليمان الأشقر | قەزاو قەدەر | ئارامی گەلاڵی | لەژێر چاپە |
| ١١ | مع الأنبياء في القرآن | عفيف عبدالفتاح طبارة | لەگەڵ پێغەمبەران لە قورئانی پیرۆزدا(١-٢) | کاوە هاوڕاز | ١٤٢١ |
| ١٢ | منهج التربية النبوية للطفل | محمد نور سويد | بەرنامەی پێغەمبەر بۆ پەروەردەی منداڵان | سهام بەرزنجی ڕێدار احمد | ١٤٢٢ |

| ت | اسم الكتاب | المؤلف | ناوی کتێب | وەرگێڕ | [illegible] |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ١٣ | ماذا خسر العالم بأنحطاط المسلمين | ابوالحسن علي الحسني الندوي | بە داڕوخانی موسڵمانان جیهان دوچاری چ دۆڕانێك بو؟! | ئارامی گەلاڵی | لەژێر چاپە |
| ١٤ | مبادئ الإسلام | أبو الأعلى المودودي | ڕێبازی ئیسلام | عمرڕێشاوی جعفرمصطفی | لەژێر چاپە |
| ١٥ | المصطلحات الأربعة في القرآن | أبو الأعلى المودودي | چوار زاراوە لە قورئاندا | احمد محمد قەرەنی | لەژێر چاپە |
| ١٦ | الزواج الإسلامي السعيد | محمود مهدي الأستانبولي | ژن و مێردی ئیسلامی بەختەوەر (چاپی ٣) | نەوا محمد سعید | لەژێر چاپە |
| ١٧ | الخلفاء الراشدون بين الأستخلاف والأستشهاد | د.صلاح الدين الخالدي | خەلیفەکانی راشدین لەنێوان خەلیفایەتی و شەهیدبوندا | فاتح سەنگاوی | لەژێر چاپە |
| ١٨ | مع قصص السابقين في القرآن (٣ مجلدات) | د.صلاح الدين الخالدي | لەگەڵ سەربردەی پێشینەکان لە قورئاندا | کاوە هاوڕاز | لەژێر چاپە |